# زمانی كوردی

# له بەرانبەر هەرەشەی شەپۆلی ئاشارەزایدا

نووسەر : موحەممەد عەلی ئووەیسی

# زمانی کوردی
# لە بەرانبەر هوروژمی شەپۆلی ناشارەزاییدا


نووسەر و توێژەر:

موحەممەد عەلی ئووەیسی

« کارناسی زمانی ئینگلیسی »

اویسی، محمدعلی، ۱۳۳٤
زمانی کوردی له به رانبه ر هوروژمی شه پۆلی ناشاره زاییدا/نووسه ر و توێژه ر موحه ممه د عه لی ئووه یسی.
بانه: ناجی، ۱۳۸۸.
۱۵۵ ص: جدول
978-964-91858-5-9
فیپا
کردی -- دستور زبان تطبیقی
کردی -- ریشه شناسی
PIR ۳۲۵٦/۱ ۲۲ ۸ الف ۱۳۸۸
ک ۹ فا ٤
کتابخانه ملی ایران ۱۹۲۰۹۳۹

**زمانی کوردی له به رانبه ر هوروژمی شه پۆلی ناشاره زاییدا**

انتشارات ناجی - بانه کردستان

---

نووسەر و توێژەر: موحەممەد عەلی ئووەیسی
پیتچن: لوقمان قادری
چاککاری و پێداچوونەوە : نووسەر
نۆرەی چاپ: یەکەم
تیراژ(بڕ) : ۲۰۰۰ بەرگ
ناوەندی بڵاوکردنەوە ( ئینتشارات) ناجی - بانە کردستان
تلفن: ۴۲۶۰۰۶۰ - ۰۸۷۵
شابک: ۹۷۸-۹۶۴-۹۱۸۵۸-۵-۹
۹۷۹۶۴۹۱۵۹۵۹-E-A-N
نرخ: ۴۰۰۰ تمه ن
ساڵی نووسین: ۱۳۸۸ی کۆچیی هەتاوی (۲۰۱۰ی زایینی)- بانە

# ناوەرۆک

به ناوی یەزدانی مەزن

Autobiography

ئۆتۆبیۆگرافی، یان ژیاننامەی نووسەر بەپێنووسی خۆی

لە ساڵی ١٣٣٤ی کۆچیی هەتاوی (١٩٥٥ی زایینی)دا لە گەڕەکی مزگەوتی حاجی ئووەیسی، لە شاری بانە لە کوردستانی ئێراندا لە دایک بووووم. لە دوای خوێندنی بڕگە و قۆناخەکانی سەرەتایی و ناوەندی لە شارەکانی بانە، سنە و سەقز، لە ساڵی ١٣٥٢ی کۆچیی هەتاوی (١٩٧٣ی زایینی) دا دوای سەرکەوتن لە تاقیکاریی کۆنکووردا کە تەمەنی ١٨ ساڵیم رائەبوورد، بە ناوی خوێنکار لە زانستگەی تاران (Tehran university) وەرگیرام و دوای نزیکەی ٤ ساڵ، بەڵگە و بڕوانامەی لیسانس(باکالۆریئاس)م لە لقی زمانی ئینگلیسیدا وەرگرت و لە تەمەنی ١٩ ساڵیدا واتە لە ساڵی یەکەمی زانستگەدا، بۆخۆم فێری خوێندن و نووسینی کوردی بە پیتگەلی عەرەبی و لاتین بووم. ئەڵبەتە لەو کاتەدا هەندێ زمانیتر وەک عەرەبی و فەڕانسەییشم ئەخوێند و بەدزیەوە هەندێ پەرتووک وەک خوێندنی کوردی بە پیتی لاتین نووسراوی گیوی موکریانی، مێژووی کوردستان نووسراوی ڕەشید عارف و موحەممەد فیدا، بەهەشت و یادگار و فرمێسک و هونەری مامۆستا گۆران و هەندێ هۆنراوەی بێکەس و قانیع و... هتد.م بە دەست ئەهێنا و ئەمخوێندنەوە، هەروا کە ئەزانن لەو سەردەمەدا لە وڵاتی ئێراندا خوێندنەوە و بەکارهێنانی پەرتووکی زمانی کوردی لەژێر سێبەری رەشی رژیمی شای ئەمریکاییدا قەدەغە کرابوو.

رەنگە یەکەمین کوردی ئێرانی بوبێتم کە لە ئێراندا ئەمتوانی بەبێ کەڵک وەرگرتن لە فەرهەنگی وشە و دیکسیۆنێڕی کوردی، زمانی ئینگلیسی وەرگێڕمەوە سەر زمانی کوردیی ویژەیی و لە دووەمین ساڵی زانستگە و خوێنکاریدا (١٣٥٣ی کۆچی - ١٩٧٤ز) کورتە چیرۆکی Vendetta(تۆڵەی

ڕۆڵە) نووسراوی (گی دۆ مۆپاسان)م لە زمانی ئینگلیسی یەوە وەرگێڕایەوە سەر زمانی کوردی. گەرچی واتاکەی بە زمانی کوردی بریتی بوو لە ڕقەبەرایەتی، یان قینلەبەرایەتیی خاوخێزانی، بەڵام پێم چاکتربوو بە (تۆڵەی ڕۆڵە) وەری بگێڕمەوە، یان بە (تۆڵەی جگەرگۆشە). لەساڵی ۱۳۵٤ (۱۹۷٦ز)دا لە زانستگە تاران بە ئۆنیفۆڕم و جل و بەرگی کوردی و جامانە وە بۆ ماوەی ٤٠ خولەک بە زمانی ئینگلیسی لە سەر کورد و کوردستان دووام و قسەو باسم کرد و لە بارەی چەوسانەوەی کورد و چەند بەش لە پەرتووکی ئینگلیسیی(کوردەکان و کوردستان) نووسراوی (دێرکینان) ئاخافتنم کرد و باسی خەباتی خوالێخۆشبوو مەلا مستەفام کرد و کردمە بەڵگەیێک بۆ وتارەکەم. لە ساڵی ۱۳۵۸ (۱۹۸٠ز) نامیلکەی نیکاراگوا و بەرەی شۆرشی (ساندینیست)م لە فارسی یەوە وەرگێراوە سەر کوردی کە شۆرشی دژی سۆموزا، ملهوڕی نیکاراگوا بوو. لە مانگی ڕەشەمەی ۱۳۷۱ی کۆچی (۱۹۹۳ز)دا گۆڤاری (سروە)ی ژمارە ۸٠ ، وەرگێڕاوی(تۆڵەی رۆڵە)ی لە چاپ دا بەڵام تەنیا (تۆڵە)ی نووسیبوو و (ڕۆڵە)ی نەنووسیبوو و وێنەی بەژدار واتە سەگێکی چیرۆکەکەی لە پاڵ وشەی تۆڵەدا کێشابوو و زۆرکەس بە (تولەسەگ)یان ئەخوێندەوە، واتە دەستکاری و دەست درێژیی ناشیانە کرابوو. ئەڵبەتە بەژدارەکە لە چیرۆکەکەدا دەور و رۆڵی هەبوو. هەروەها بێجگە لە هەندێ نووسراوە و بابەتی جۆراوجۆر و پارچە هۆنراوەی کوردی کە بۆخۆم نووسیبوومن، چەند کورتە وەرگیراوی تر وەکوو: کورد لە یەکیەتیی سۆڤیەتی پێشوو و لە بارو دۆخی ئەمڕۆدا کە لە زمانی ئینگلیسی یەوە وەرمگێڕابووەوە، لە گۆڤاری ناوبراو و گۆڤاری تردا لە چاپ دران و تا ئەو کاتە، کوردی ئێران شارەزای وەگێڕانی نووسراوەی زمانی ئینگلیسی بۆ سەر زمانی کوردیی وێژەیی بە شێوەی ڕاستەوخۆ، نەبوون. بە دوای ئەوەدا، بە هۆی تەگەرە و لەمپەری هەندێ کەسی بەرچاوتەنگ لە بووڕۆ و نووسینگەی گۆڤاری سروەدا، نووسراوە و وەرگێڕاوەکانی من لە چاپ نەئەدران و ئەمە بووە هۆی ساردبوونەوەی من لە نووسین و وەرگێڕان، تەنیا کاک مارف ئاغایی باش بوو و بەداخەوە هەر لەو کاتانەدا کۆچی دوایی کرد. تەنانەت

جارێک سکاڵانامەم نارد بۆ وەزیری فەرهەنگ و ڕێنوێنیی ئیسلامی لە تاران و لەو کاناڵەوە توانیم زەمینەی چاپی وەرگێڕاوێکم بەدی بهێنم. هەروەها گیروگرفت و باری ئابووری و کەم و کوورِیی ژیان و بێکاری و نەبوونی بژیو و هەندێ هۆکاری تر، بوونە مایەی ئەوە کە قۆرت بکەوێتە ناو کارەکەم و دەست لە نووسین و وەرگێڕان و هۆنراوە هەڵگرم.

با ئەمەیش بگێڕمەوە کە لە دوایین ساڵەکانی ڕژیمی شادا، بۆ ماوەی ٢ ساڵ لە سەربازگەکانی تانک و زرێپۆش لە شارەکانی شیراز و کرماشاندا بە ناوی سەربازی و ستواندووەم، ئەفسەری ئەرک وجێگری فەرماندەری سریە و گرووهان بووم و لە دوای رووخانی رژیمی شا، بۆ ماوەیێکی کورت لە بانە مامۆستای زمانی ئینگلیسی و کاربەدەست بووم.

شایانی باسە لە سەردەمی شادا کە لە کرماشان لە سەربازەگەی تیپی زرێهی (درووع) بووم، دوای نیوەڕۆیان کە ئەهاتمەوە بۆ ناو شاری کرماشان، لە ماوەی ساڵێکدا دەیان جار چووم بۆلای بەرپرسیارانی بەشی کوردیی رادیۆ کرماشان تا لەوێ جارجار کاری نووسین و وەرگێڕانی کوردی بکەم، تەنانەت چووم بۆ لای بەڕێوەبەر و هەڵسووڕێنەری گشتیی رادیۆ – تێلێویزینی کرماشان ، بەڵام هەرگیز وەرنەگیرام چونکە فایلی رامیاریم لە لایەن ساواکەوە خراپ بوو و تەنانەت بە تاوانی دژایەتی لەگەڵ رژیمی شا و هەبوونی هەستی نەتەوەپەرستی و هەنگاوهەڵ هێنان لە پێناوی رووخانی رژێم و سەرپێچی و لاساری و تمرد و لایەنگری لە ئیمام خومەینی و خۆپێشاندەران، ماوەیێ لە سەربازگەی تیپی ٢ی زرێهی لە کرماشان گیرام و دەست بەسەر بووم و ماوەی چەند مانگیش لە ریزی کار لابرام و لە ناوەندی ستادی فەرمانەریی تیپ (بڕیگاد)دا دەست بەسەر و لە ژێر چاودێریی دژی سیخوری (ضد اطلاعات)دا بووم و ئیدارەی پایەی دووەمی زانیاری و راگەیاندن واتە (رکن دوم اطلاعات) بەسەرۆکایەتیی حەیات غەیبی هەروەها ئەفسەری ئاژدانی فەرماندەری بڕیگاد بە ناوی ئاریامەند، منیان خستبووە ژێر چاودێری و دەست بەسەری و حەیات غەیبی بەتاوانی هاوکاری کردن لەگەڵ

ئەفسەرانی دژی ڕژیمی شا، چەند جار منی موحاکمە و دادگایی کرد و فایلی بۆ دروست کردم و شاهێدێکی بانەیی‌ی بە ناوی (گورووبان(عەریف) ئەحمەد ... )ی هێنا بۆ سەپاندن وسەلماندنی تاوانەکە و ژێنێراڵ سەرتیپ عەمید جەواد باقری کە کوردی لەکی هەرسینی بوو لەگەڵ مندا دژی رژیمی شا و لایەنگری ئیمام بووین و ئەوکاتە باقری لێفتنانت واتە ستوان یەکەم (ملازم اول) بوو و زۆری پێ نەچوو کە ئەرکان و پایەکان و کۆڵەکەی رژیمی شا ڕووخا و توانیمان هەناسەی قووڵی سەربەستی و ئازادی هەڵمژین.

لە سەردەمی شادا بەڕێزان عەلەوی، هومایوون (محمد) کەمانگەر، خوسرەوی، لهۆنی، عوسمان ئەحمەدی، ئەشرەف کەمانگەر و زۆرکەسی تر، لە رادیۆی کرماشاندا کاربەدەست بوون. سەرئەنجام ئەو رۆژە کە رژیمی شا ڕووخا، چوومە ناوەندی رادیۆ تێلێویزیۆنی کرماشان و بە چەشنی راستەوخۆ و زیندوو بە ناوی ئەفسەرێکی کورد پیشتیوانیی‌خـــــۆم بۆ شۆڕشی گەلانـــی ئێران دەربڕی و ئیتر کەس نەیتوانی لەگەڵمدا بەربەرەکانێ بکات و هەتا حەوتەییێک هەموو ڕۆژێک کە لە سەربازگەوە ئەهاتمەوە بۆ ماڵەوە، ئەچووم بۆ ناوەندی رادیۆ تێلێویزیۆن و هۆنراوە و دروشم و نووسراوەی شۆڕشگێڕانەم بە کوردیی پەتی و راستەوخۆ ئەخوێندەوە و کاک هومایوون کەمانگەر و کاک عوسمان ئەحمەدی لەوێ بوون.

ماوەی چەند سالێک بوو دڵم پێوە بوو کە هەنگاوێک لە سەر رێبازی یەکلاکرانەوەی زاراوە و شێوەگەلی سۆرانی و لە پێناوی زمانێکی زانیاریی یەکگرتوو و زانستیدا هەلبهێنمەوە و تاوم دایە نووسینی ئەم پەرتووکە و هیوادارم ئەگەر کەم و کووڕی و هەڵە و چەوتی لە نووسراوەکەمدا هەست بکرێت، لە بەرچاو و بەدلەوە نەگیرێت چونکە تەنیا یەزدانی دلۆڤان تووشی هەڵە نابێت و گشت مرۆڤەکان تووشی هەڵە ئەبن و بڕوایشم بە نووسراوەکەی خۆم هەیە و زۆرتر لە مێشک و بیری خۆم کەڵکم وەرگرتووە و بە دەگمەنیش کەڵکم لە سەرچاوەی تر وەرگرتووە و ئەو سەرچاوانەیش کە بۆ هەڵسەنگاندن و رەخنە کەڵکم لێ وەرگرتوون بریتین لە پەرتووکگەلی: ١-ئەو وشانەی لە چاوگەوە

وەردەگیرێن/د.ڕەفیق موحەممەد شوانی/ دهۆک۲۰۰۸، ۲-بەستاندارکردنی زمانی کوردی و ئەلفوبێی کوردی/د.ڕەفیق سابیر/سلێمانی ۲۰۰۸، ۳-زمانەوانی/سەلام ناوخۆش- نەریمان خۆشناو/هەولێر۲۰۰۸. دیارە ئەگەر زۆر کەس بەشی زۆری نووسراوەکەم وەرگرن و پەسەندی بکەن، هەندێ کەسیش هەن کە وەری ناگرن، ئیتر لە بەر بەرژەوەندی بێت یان هەستی ناوچەپەرستی، یان ناشارەزایی و بەرچاوتەنگی یان بیرو بۆچوونی خۆیان یان ڕەخنەیان هەبێت و یان لە من شارەزاتر بن. منیش وەک زۆر کەس ڕەخنەم لە سەرە؛ تا زیان نەکەین، قازانج ناکەین. زمانی کوردی بە ڕەخنە ساماندار و ڕێک و پێک ئەبێت و یەکلا ئەبێتەوە و ڕاست ئەکرێتەوە، بەڵام بە ڕەخنەی سازەر نەک تێکدەر، ڕەخنەی چاککاری نەک ڕەخنەی لاساری و بێئاگاداری و بێ زانیاری.

موحەممەد عەلی ئووەیسی

بانە - ۲۰/بەفرانبار/ ۱۳۸۸ی کۆچیی هەتاوی بەرانبەر لەگەڵ ۲۰/ بەفرانبار / ۲۷۰۹ کوردی و ۲۰۱۰/۱/۱۰ ز

## بەشی یەکەم

### سه ره تا

لەم هەل و مەرج و بارودۆوخە رەخساوەدا کە زۆر کەس لە پسپۆڕان و زانایانی زمانی کوردی، بۆ بەستانداردکردنی زاراوەی سۆرانی تێ ئەکۆشن، بەداخەوە بەهۆی نەزانی، هەســـــتی ناوچەپەرســـــتی، نەبوونی هەستی لێ پرســـراوەتی و بەرپرسایەتی، کورت بینی و کورت بیری و زۆر هۆی ترەوە، لە سەر رێبازی ئەم هەنگاوە گرنگەدا کەندوکۆسپ و لەمپەر سەری هەڵ هێناوە و لە جیاتیی زمان و زاراوەی ستاندارد و یەکگرتوو، زمانی کوردی و بەتایبەت زاراوەی سۆرانییان کردووە بە چێشتی مجەور و زەبری کاری و تێکدەرانەیان لە رێزمان و بنەڕت و بنچینەی زمانەکەمان داوە. تەنانەت جارجار، هەندێ کەس لە پسپۆڕان و نووسەران و زانایانیش تووشی هەڵە و چەوتی بووون.

بە بڕوا و بیروڕای من، پسپۆڕانی زانا و بەڕێز کە ئەیانەوێ زمانی یەکگرتوو و ستاندارد بنووسن و بناسێنن، ئەبێ سەرەتا تێ بکۆشن زاراوەی سۆرانیی ستاندارد یان ستانداردی سۆرانی بەڕێک و پێکی و بە پێی زانیاری بەدی بهێنن و یەکلایی بکرێتەوە، ئەمجار بیکەن بەزمانی ستاندارد و یەکگرتووی کوردی چونکە زۆرجار هەندێ لەم شێوە سۆرانی یە کە لە هەندێ تێلێویزیۆن و رادیۆ و میدیا و رۆژنامە کوردی یەکانەوە بڵاو ئەبێتەوە، بەپێی زۆر بەڵگە و لە زۆر بارەوە شێوەی زانیاری و عیلمی نین و بەتایبەت لە باری رێزمان، وشە و فرەیز، ئایدیۆم، فۆنێتیک و

دەنگ‌ناسی و چەند بابەتی ترەوە هەڵەن. رەنگە زۆرکەس بەم قسە و بیرورِا و نووسراوانەی من نیگەران و بەپەرۆش ببن، بەڵام گەرچی (اَلحَقُّ مرّ وَلَو کان درّ) زۆر کەسانی‌تر هەن کە زۆریان پێ‌خۆشە و گەرچی ماف و راستەقینە و حەق تاڵە و ئەگەر دورِ و گەوهەریش بێ، کەم کەس وەری ئەگرن، بەڵام ئەمرِۆ لەسایەی زانیاری و پێشکەوتن و تێگەییشتنی مرۆڤدا، زۆر کەس دیان بە راستەقینەکاندا ئەنێن. رەنگە هەموو کەسێ ئەم ریسکە نەکات و زۆربەی کەسان بیریان بەلای ئەمەدا نەچووبێ کە هیشتا شێوەی ستانداردی سۆرانی لە زاراوەی سۆرانیدا نەناسراوە و نەدۆزراوەتەوە و نەنووسراوە و یەکێ لە هۆیەکانی یەک‌لانەکرانەوە و ستانداردنەبوونی زاراوەی سۆرانی، هەڵەبوونی شێوەی موکریانی و شێوەی ناوچەی (سۆران)ە و ئەمرِۆ بەرەبەرە ئەبینین و ئەبیسین کە شێوەی موکریانی و پارێزگەی ئازەربایجانی رۆژئاوای ئێران و شێوەی ناوچەی سۆران لە پارێزگەی هەولێری کوردستانی عێراق، تا رادەیێک دەوری سەرەکییان لە نووسین و وتن و چاپەمەنی و بڵاوکراوەکانی تێلێویزیۆن و رادیۆ و گۆڤار و رۆژنامە کوردی‌یەکانی ئێراق و ئێراندا گیرِاوە و ئەگێرِن و هەڵبژێررانی هەولێر بە پێتەختی کوردستانی عێراق و تارِادەیێ دابین‌کرانی ورمێ بە ناوەندی بڵاوکراوەکوردیەکان وەک گۆڤاری سروە، یەکێ لە هۆکارەکانی ئەم راستەقینەیە، بەڵام بۆ هەمووکەسێکی شارەزا و تەنانەت بۆ هەولێری‌یەکان روون و ئاشکرایە کە شێوەی هەولێری و ناچەی سۆران لە باری زانیاری و زمانناسی و رێزمان و فۆنێتیک و وشەناسی‌یەوە هەڵەیە و بەتایەبەت ئەم هەڵەیە لە کاتی قسەکردن و پەیڤ و دووانی ئەواندا دەر ئەکەوێت و دیارە لە

چەند رۆژگار و برگەیێکی مێژووییدا موکریانیش ناوەندی دەسەڵات و حوکوومەت و فەرمانڕەوایی و رامیاریی کوردستان بووە، بەڵام ئەمە نیشانە و بەڵگەی ئەوە نیە کە شێوەی زمانەکەیشی وێژەیی تر بووبێت. بەداخەوە، وەک زۆربەی نزیک بە گشتی زمانەکانی نەتەوەکانی جیهانی پان و بەرین، زمانی ئێمەیش لە هیچ شار و ناوچە و مەڵبەندێکدا بە شێوەی ستاندارد و عیلمی و زانستی قسەی پێ ناکرێت و ئاخاوتنی پێ ناکەن و هەمووی شێوەکانی زاراوەی سۆرانی کەم‌وکووڕی و ناتەواوی و هەڵەیان تێدا هەیە. من سێ شار و ناوچەم پێ باشە کە دانیشتووەکانیان شێوەی زمانەکەیان لە چاو ناوچە و هەرێم و دەڤەرەکانی تردا کە بە زاراوەی سۆرانی (کرمانجیی باشووری) قسە ئەکەن، وێژەیی تر و رێک وپێکترە و گەرچی ئەوانیش خۆیان هەڵەیان تێدایە بەڵام هەڵەکانیان لە باری زانستی یەوە زۆر کەمتر لە هەڵـەکانی شێوەکانی ناوچـــــە-سۆرانی نشینەکانی ترە. ئەو سێ شارە بریتین لە **بانە** (بێجگە لە ناوچەی خێڵەڕەش و دەشتەتاڵ و پشتی رێگای سەردەشت و بەشی نەنۆر) لە پارێزگەی کوردستانی ئێران واتە زمانی **خەڵکی رەسەنی ناوشاری بانە**، **سلێمانی** لە کوردستانی عێراق و **سێ بەش لە گوندەکانی بۆکان** لە پارێزگەی ئازەربایجانی رۆژئاوایی لە ئێران. ئەبێ ئەم سێ شێوەیە زۆر زانایانە بکرێن بە هەوێن و بنەما و بنەڕەتی زمانی کوردیی سۆرانیی ستاندارد و بەتایبەت شێوەی بانەیی لەو دوو شێوە بۆکانی و سلـــــێمانی یەیش باشـــتر و وێژەیی ترە. شایانی ناوبردنن کە شێوەگەلی سێ شاری **چوارتا**، **پێنجوێن و قەڵادزێ** لە پارێزگەی سلێمانی تا رادەیێک

ویژەیین. ئەگەرچی شێوەی بۆکانی یەکێ لە شێوەکانی موکریانی یە، بەڵام شێوەی گوندەکانی بۆکان لە چاو شێوەکانی مەنگوڕ و مەهاباد، کۆیسنجاق، پیرانشار، شنۆ، سۆران(هەولێر) ... هتد باشتر و ویژەیی ترە، چونکە ئەگەر لە بۆکانەوە هەتا هەولێر رێگا ببڕین و تاکوو ئەو چەند شارە ناوبراوانەی موکریان و سۆران رێگا بپێوین، شێوەی زمانەکە هەڵەی زۆرتر ئەبێ و کاتێ ئەگەینە هەولێر و سۆران و دەوروبەریان، هەڵەکان زۆر زەق تر و هەستپێکراوتر ئەبن. ئێمە ئەتوانین بڵێین سۆران لە پارێزگەی هەولێر، شێوەیێک لە زاراوەی سۆرانی و شێوەیێکیش لە موکریانی یە و یان ئەتوانین بڵێین چەشن و شێوەیێک لە زاراوەی کرمانجیی باشووری یە و بەداخەوە هەڵەی یەکجار زۆری تیادا هەیە.ئێمە کە چەند شێوەی جۆربەجورمان لە زاراوەی سۆرانی(کرمانجیی باشووری)دا هەیە و بۆ وێنە بریتین لە شێوەگەلی سۆران، موکریانی، بانە و سلێمانی، ئەردەڵان، تیلەکۆیی، بابان، گەرمیان و ...هتد ئەبێ ئەم راستـــــــی یە بسەلمێنین و وەربگرین کە **شێوەی زمانی رەسەنی بانەیی** بێجگە لەوە کە شێوەیێکی ویژەییتر و ئەدەبی ترە، تەنانەت لە شێوەی سلێمانیش راست و دروست ترە، بۆ وێنە لە سلێمانی ئەڵێن «یاومەتێ» بەڵام لە بانە ئەڵێن «داومەتێ». لە سلێمانی ئەڵێن «ییم» بەڵام لە بانە ئەڵێن «دێم».

ئەم (دال)ە پێویستە و ئەبێ بنووسرێت و لەگەڵ پیتی (د)ی موکریانیدا کە لە سەرەتای وشەی کردەوە (فعل)دا ئەنووسرێ و ئەوترێ (وەک دەڕۆم — دەزانم) جیاوازە. (ییم) و (یاومەتێ) هەڵەیە. یا ئەڵێن ئەوبینم. ئەمەیش هەڵەیە و ئەبێ

بلێین و بنووسین ئەتبینم چونکە پیتی (ت) نیشانە و ئامرازی راناو یا جێ ناو (ضمیر)ە. ئەمڕۆ بەداخەوە شێوەزمانی رەسەنی بانەیی بەرەبەرە خەریکە ئەگۆڕێت و رەسانایەتیی خۆی لە دەست ئەدات و ئەوەیش بێجگە لە بەکارنەبرانی لە خوێندن و نووسیندا، چەندهۆی تری هەیە کە بریتین لە ١- پەیوەندی و هاتووچووی لەڕادە بەدەری خەڵکی بانە لەگەڵ خەڵکی شارەکانی سنە و سەقزدا کە شێوەی زاراوەکەیان وێژەیی نیە و زمانی فارسی کاری زۆرتری تێکردووون. بۆ وێنە تا چەند ساڵ لەمەپێش لە بانە بەڕەنگی (شین) هەر ئەوترا شین، بەڵام ئیستا زۆرکەس ئەڵێن (ئاوی) کە لە شێوەی ئەردەڵانی، سەقزی و زمانی فارسی یەوە وەریانگرتووە و تەنانەت خەڵکی رەسەنی سنە بە شین ئە لێن (کەوگ)و زۆر کەس ئیستا لە بانەیش بە (قەڵەو) ئەڵێن چاخ و بە (ئەستوور) ئەڵێن کولوفت و بە (سەهۆڵ) ئەڵێن یەخ. زۆر کەس لە بانە لە جیاتیی ئەوە کە بڵێن «داویانمێ»، ئەڵێن پێیانداوم، لە جیاتیی داومەتێ ئەڵێن پێمداوە. دیارە یەکێ لە هۆیەکانی ئەم کارتێکرانە، خۆبەکەمزانیی هەندێ کەس و بەچاوی سووک سەیرکرانی خەڵکی شاری بانە لە لایەن کۆمەڵێکی ساویلکەی دواکەوتووی تازەپیاکەوتووەوەیە و خەڵکی بانە لە لایەن هەندێ لە کەسانی دواکەوتووی فەرهەنگی یەوەیە کە لەم چەند ساڵی رابووردووەدا لە ناو شاردا نیشتەجێ بووون، تەنگیان پێهەڵچنراوە. ٢- هۆیێکی تری ئەم گۆڕانکاری یە، پەرەپێدرانی بازرگانی و بازاڕی شار و سنووری شاری بانەیە و پەیوەندیی بازرگانی کاری کردووتە سەر شێوەی زمانی بانەیی و تەنانەت شێوەی عێراقی و سلێمانی لەم کارەدا بێ شوێنەوار نیە. ٣- هۆیێکی تری

کارتێکرانی شێوەی بانەیی کە زۆر گرنگە ، ئەوەیە کە لەم چەند ساڵی رابووردووەدا دەیان هەزار کەس لە دانیشتووەکانی گوندەکانی ناوچەی دەشتەتاڵ لە نێوان بانە و سەردەشت و پشت جادەی سەردەشت و گوندەکانی ناوچەی خێڵەڕەش لە نێوان بانە و ماوەتدا کە شێوەی زمانەکەیان تاڕادەیێک ئەچێتەوە سەر شێوەی موکریانی، کوتوپڕ و لە ناکاو هوروژمیان هێناوە بۆ ناو شاری بانە و نزیکەی ٧٠ لە سەد (سەدی حەفتا)ی ناوەندە ئابووری- یەکان وەک پیلەوەری (بازرگانیی نێوان ئێران و کوردستانی عێراق لە رێگای دەوڵەتیەوە) و ئاژانس و ناوەندەکانی کڕین و فرۆشتنی ناو پاساژ و بازاڕ و دووکانەکان و قاچاخچیەتی و شۆفێڕی و تەنانەت کارەکانی ناو ئیدارە و دامودەزگا دەوڵەتیەکانیان داگیرکردووە و خستوویانەتە ژێر دەسەڵاتی خۆیان و لە ئاکامدا پۆتانسییێل و توانایی یە ئابووری یەکانیان بۆ خۆیان تەرخان کردووە و تەنانەت ئاژانسەکانی سەودای خانووی بەکرێ وئوتۆمۆبیل‌فرۆشی و پارەگۆڕینەوە و لە ئەنجام و ئاکامدا فەرهەنگ و شێوەی هەڵس و کەوت لەگەڵ یەکتردا و زۆر کار و باری تر کەوتووەتە دەستی ئەوان و سەرئەنجام شێوەی زمانەکەیشمان کەوتووەتە ژێر شوێنەوار و کارتێکرانی شێوەی دەشتەتاڵ و خێڵەڕەش و پشت جادەی سەردەشت و تا رادەیێ شێوەی دانیشتووانی گوندەکانی بەشی نەنۆر لە رۆژهەڵات و باشووری رۆژهەڵاتی شاری بانە.

بۆ نموونە لە بەر ئەوە کە ئەو دوو ناوچەیە (خێڵەڕەش و دەشتەتاڵ) وەک موکریان لە جیاتیی نیشانەی ئاماژە بۆ نزیک واتە(ئەمە)، نیشانەی ئاماژە بۆ دوور (ئەوە)

بەکار ئەهێنن و ئەگەر بڵێن: «دوومانگ لەمەپێش»، ئەڵێن: «دوو مانگ لەوە پێش» یا ئەگەر بڵێن:«دوو ڕۆژ لەمەپێش»، ئەڵێن:«دوو ڕۆژ لەوە پێش»، ئیستا زۆر کەس لە بانەیی یەکان کە خەڵکی ناوشارن و لە گەڕەکەکانی خواروو و لە دەوروروبەری گەڕەکە خێڵەڕەشی و دەشتەتاڵیەکاندا نیشتەجێن یا لە نزیک ئەوان و لە لای ئەوان کار و بازرگانی ئەکەن، زورجار لە جیاتیی (لەمەپێش) ئەڵێن (لەوەپێش) واتە ئەگەر بڵێن دە ڕۆژ لەمەپێش پارەم بۆ ناردی، ئەڵێن دە ڕۆژ لەوەپێش پارەم بۆ ناردی. ئەمەیش یەکێ لە کاریگەری یەکـانی ئەو شێوە ناوبراوەی ناوچەکانی دەشتەتاڵ و خێڵەڕەش و پشت جادەی سەردەشت لە سەر شێوەی زمانی خەڵکی ڕەسەنی ناوشاری بانەیە، چونکە هەروا کە وتمان، خەڵکی کۆچکردووی ئەو ناوچە ناوبراوانە، باری ئابووریی شارەکەیان خستووەتە ژێر دەسەڵاتی خۆیان و لە ئاکامدا نەتەنیا فەرهەنگی کۆمەڵایەتی، بەڵکوو شێوەی زمانەکەیشیان گۆڕیوە.

ئەبێ ئەمەیش بڵێین کە کۆچی هـەزاران کـەس لـە خەڵـکی گونـدەکانی ناوچـەی بەشی نەنۆر و بەشی سەرشیو لە لای باشووری ڕۆژهەڵات و لای ڕۆژهەڵـاتەوە بـۆ ناوشاری بانە بە نۆرە و ڕادە و گوێرەی خۆی کاری کردووەتە سەر باری ئابووری، فەرهەنگ، زمان و هەڵسوکـەوتی دانیشـتووانی ڕەسـەنی نـاو شـاری بانـە، بەڵـام شوێنەوار و ئاسەواری ئەمان لـەچاو شـوێنەوار و کـارتێکرانی فەرهـەنگی خەڵـکی دەشتەتاڵ، مەیدانان و پشت جادەی سەردەشت و خێڵـەڕەش و بەشـی ڕۆژئـاوای کێـوی گاکڕ(بڵـوو) زۆر کـەمترە. جێگـەی داخـە زۆر بەدەگمـەن پسـپۆڕ و زانـا و

زماننـاس و نووسـەرەکان سـەرەنجیان داوەتـە شـێوەی بانـەیی و بـۆی هەیـە لـە داهاتووی نزیکدا ئەم شێوە ڕەسەنەی زمانی کوردی، ڕەسەنایەتی و باری وێژەیی و مێژوویی خۆی لە دەستبدات و ئەمە لە کاتێکدایە کە شێوەی ڕەسەنی بانـەیی گەرچی لە باری وێژەیـیـیـەوە جارجـار هەڵـەی تێدایـە، بەڵـام لـە نووسـراوەکانی بەشەکانی داهاتوودا ئەیسەلمێنین کە لە زۆر بارەوە لە چاو شێوەی زمانی خەڵـکی موکریان و تەنانەت لە شێوەی زمانی خەڵکی سلێمانی وێژەیی‌تـر و دروسـت‌تـر و ڕێکوپێکترە و پسپۆڕەکان ئەبێ بیر لەوە بکەنەوە کە بانە خاوەنی چەندهەزارسـاڵ مێژووە، چ لە کـاتی هێرشـی (ئەسـکەندەری مەقـدوونی)دا لـە ڕۆمـی ڕۆژهەڵـاتی ئورووپاوە و چ لـە کـاتی هـاتنی سـپای ئیسـلام لـە سـەردەمی ئیمـامی عومـەر بـە سەرۆکایەتیی خالیدی کوڕی وەلید و عەبدوڵلای کوڕی عومەردا، مێژووەکەی تۆمار کراوە، بەڵام شاری سـلێمانی لـە سـەردەمی دەسەڵـاتی ئیـبراهیم پاشـادا بناخـەی دانراوە و مێژووەکـەی ناگەڕێتـەوە بـۆ ٣٠٠ سـاڵ لـە مـەپێش و زۆر کەسـیش لـە خەڵکی سلێمانی، بانەیی بووون کە کۆچیان کردووە بـۆ ئـەوێ. هـەروا هەنـدێ لـە شارەکانی موکریان و تەنانەت شاری سـنەیش ٣٠٠ سـاڵ ئـەبن. زانایـانی بـەڕێز ئەبێ لێببڕێن و لەگەڵ لەناوچوون و گۆڕانی شێوەی بانـەیی و وشـە ڕەسـەنەکانیدا بەربەرەکانێ بکەن و هەستی لێپرسراوەتی بکەن و نەیخەنە پشت گوێ. تەنیا سـێ شێوە لە شێوەکانی زاراوەی سۆرانی (کرمانجیی باشووری) وێژەیی و ئەدەبین و بۆ نووسین و خوێندن و وەرگێڕان وتێلێویزیۆن باشتر لە شێوەکانی ترن و ئەوانەیش بریتین لـە شێوەکانی لاپەڕەی دوایی ، گـەرچی ئەمـانەیش بۆ خـۆیان تا ڕادەیـێ

هەڵەیان تێدا ئەبینرێت و ئەبیسرێت :

١- شێوەی بانەیی ٢- شێوەی سلێمانی ٣- شێوەی بۆکان لە گوندەکانی ناوچەی گەورک لە باشووری بۆکان و گوندەکانی بەشی رۆژهەڵاتی بۆکان تا سنووری فەیزوڵلابەگی و داشبەند و سایەنقەلا و ئەتوانین بڵێین کە شێوەی دەڤەری(بورهان)یش لە نێوان بۆکان و مەهابادا ویژەییە.

مەبەست لە ناوچەی گەورک، باشووری شاری بۆکانە وەک:گوندەکانی تورجان، قازانتە، ئینچکە، باخی شێخان، کانی درێژ،ئیسکی بەغدا، گلۆڵانی سەروو وخواروو، زیرِاندۆڵ، مووسێ، خورِخورِە، ئاخ وەتمان، برایم خەسار و ... هتد کە هەندێکیان ئیستا لە بەشی سەقزدان. لە ژمارە و نووسراوەکانی داهاتوودا بەشێوەیێکی سیستماتیک و رێک وپێک رەخـــــنە و بۆچوونەکانی خۆم سەبارەت بە شێـــــوەی موکریانی و شێوەکانی تری زاراوەی سۆرانی ئەخەمە سەر لێنووس و ئەو کەسانەی کە برِوایان بە زانیاری و راستەقینە هەیە، بۆیان دەر ئەکەوێت کە تەنانەت زۆر کەس لە نووسەران، وەرگێرِەکان و وێژەرەکانی تێلێویزیۆن و رِۆژنامە و رادیۆکانی وڵات و هەرێم و ناوچە کوردنشینەکان بە هۆی ناشارەزایی و نەزانیەوە، زۆرجار شتی هەڵە بڵاو ئەکەنەوە و لە کاتێکدا لە کوردستانی عێراق یا باشووریدا زیاتر لە سێ چارەکە سەدە ئەبێت کە زمانی کوردی ئەخوێنرێت و ئەنووسرێت و لە سەردەمی شێخ مەحموودی نەمرەوە لەوێ زمانی کوردی تا رادەیێک ئازاد بووە و لە نزیکەی نیو سەدە لەمەپێشەوە زمانی کوردی لەوێ لە فێرگە و زانکۆکاندا خوێنراوە و بەزمانێکی نەتەوەیی ناسراوە و سەدان پەرتووک و

گۆڤاری پێ نووسراوە و پێی وەرگێڕراوەتەوە و ئیستایش زمانی فۆڕمیی عێراقە، بەڵام هیشتا زۆرکەس هەن کە لە پڕۆگرام و بەرنامەکانی ئەو وڵات و هەرێم و مەڵبەندەدا بەهەڵە شت ئەنووسن و ئەخوێننەوە و ئامـــادەنین لە وتوویژی تیلیڤیزیۆنیدا ئەم راســـتی یەیـــان پێ راگەیێنرێت کە زۆر جار نووسراوە و فیلمی وەکوو خۆی و بەبەڵگە و موستەنەد بڵاو ئەکەنەوە کە لە زمانی عەرەبییەوە و یان لە زمانەکانی ترەوە وەریانگێراونەتەوە و بەتایەبەت لە بەرنامەکانی کوردستان تی.ڤی و کوردساتدا بڵاو ئەکرێنەوە و پیشان ئەدرێن، زۆرجار لە هەندێ فیلم و بەرنامەدا بەداخێکی زۆر و سەرسووڕمانەوە ئەبێ بڵێین بەچەشنێ وەریانگێڕاوەتەوە کە فەرهەنگی عەرەبی یا فەرهەنگی زمانێکی تریان هێناوەتە ناو زمانی کوردی و لە ئاکامدا واتای ڕاستەقینە و بنەڕەتیی خۆی لە دەست داوە. ئەمانەیش لە بەشێکی تری وتار و ویژەی بەرنامە و بیروڕاکەماندا باسیان لێ ئەکەین و شییان ئەکەینەوە و تاوتوێیان ئەکەین و هەموویان بە بەڵگە و دەلیلی بڕوا پێکراو ئەسەلمێنین و نموونەی زۆر ئاسایی و ساکاری ئەمانە بریتی یە لەوە کە لە ساڵی (٢٠٠٧)دا تیلیڤیزیۆنی کوردستان تی.ڤی فیلمێکی وەکوو خۆی (مستند)ی بڵاو ئەکردەوە و بەناوی پڵنگەوە بوو واتە لە بارەی پڵنگێکەوە وەریانگێڕابووەوە. دوو ڕۆژ لە بەرنامەکانیاندا ئەیانوت پڵنگ، بەڵام بەداخەوە ئەبێ بڵێم ئەو گیان لەبەرە پڵنگ نەبوو، ئەو گیان لە بەرە (بەور) (بەبر) بوو. دیارە پڵنگ پەڵەپەڵە و بەڕەنگی زەرد و ڕەشە و بە زمانی فارسی پێی ئەڵێن پەلەنگ بۆیە ئەم ناوەی هەیە چونکە لەشی پەڵەپەڵەیە، بەڵام بەور (بەبر) لەشی ڕێ ڕێ و هێڵ هێڵە و ڕەنگی لەشی زەردی

مەیلەونارنجی یا خود مەیلەو پرتەقالی و ژێرسکی تارادەیێ سپی یە و لە چاو

پڵنگدا گەورەتر و زل و زەبەلاحترە و رەنگە زۆر (بەبڕ bebirr) بێ بۆیە پییان

وتووە بەبر. بەداخ و سەرسووڕمانەوە دیسان ئەبێ بڵێم کە لە بەرنامەکەی

تێلێویزیۆنی ناوبراودا لە جیاتیی بەبر، بە پڵنگیان وەرگێڕابووەوە و وەک ئەوە وایە

بە ڕێوی بڵێین چەقەڵ و شەوی ۱/۱/۲۰۱۰ لە سەر۲/۱/۲۰۱۰ هەر تێلێویزیۆنی

ناوبراو لە فیلمێکی وەکوو خوێدا لە بارەی پڵنگێکەوە لە سایبێریای رووسیە ،

بەرنامەی بڵاو ئەکردەوە و بەناوی (**پڵنگی سایبێریای فێڵباز**)ەوە بوو ،بەڵام

ئەوگیانلەبەرە بەور( بەبر) بوو نەک پڵنگ. دیسان وەک ئەمە وایە کە بە **گورگ**

بڵێین **سەگ** و ئەبێ کوردێکی ناشارەزا لەگەڵ زمانی کوردیدا (وەک من) کە لە

سەردەمی شاوە بە زمانی کوردی وانەی نەخوێندووە ، لە وڵاتێ کە لە سەردەمی

شادا هەبوونی پەرتووک و گۆڤارێکی کوردی، چەند ساڵ بەندیخانەی بەدواوە بوو،

ئەمڕۆ رەخنە لە کەسانێک بگرێت کە لە ساڵی (۱۹۹۱)ەوە نیوە سەربەخۆن و لە

دوای رژیمی عارفەوە بە کوردی ئەخوێنن و لە دوای رووخانی رژیمی بەعسەوە، لە

وڵات و مەڵبەندێکی فیدراڵیدا ئەژین. ئەو کەسانە تەنیا زەبر لە بەرنامەکانی

مەڵبەندی ناوبراو نادەن، بەڵکوو زەبرو زیان لە فەرهەنگ و کولتوور و نەریتی

کوردی ئەدەن. خزم خزمێنێ و پەیوەندی بازی و گەندەڵیی ناو داییرەکان و

نەزانی و نەبوونی پێوەرێکی یاسایی و ویژدانی بۆ دامەزرانی هەندێ کەس لە

دامودەزگا میری یەکاندا، ئەم چەشنە دەرئەنجام و بەرهەمانەی لێ دەر ئەکەوێت و

ئەمە نموونەیێکی زۆر ئاسایی بوو کە باسم کرد . لە کۆتایی و دوایین دێڕەکانی

بەشی یەکەمی وتارەکەماندا، بە پێویست ئەزانم بە زانایان و پسپۆڕانی بەڕێز رابگەیێنم کە لە راستەقینەدا زۆربەی کوردەکانی ناوچەی ئەردەڵان ئارەزووی زۆریان نیە کە فێری شێوەی موکریانی یا هەولێری ببن، بەڵام لەگەڵ شێوەی زمانی بانەییدا سازگارترن و لە بەشەکانی داهاتوودا بۆمان دەر ئەکەوێت و هەست ئەکەین کە چۆن زۆرجار بەم شێوە زمانە ناوبراوە نووسراوەی چەوت و هەڵە ئەخوێنینەوە و یا وتاری لەو شێوە ئەبیسین.

ئایا چۆن چاوەڕوانی ئەوەبین کە **کوردێکی زوڕباتیە** یان **کوردێکی ئەلەشتەر** مەیلی فێربوونی زمانی کوردی لە دەروونیدا هەڵقوڵێ و بۆمان دەرئەکەوێ کە بۆخۆیشمان شێوە و زاراوە و زمانەکەمان بۆ یەکلا نەکراوەتەوە چونکە لەبەر نەزانی و هەستی ناوچە پەرستی و بیروڕای چەوت و هەستیاربوونی زۆرکەس سەبارەت بە راستەقینە، نەتەنیا زاراوە و زمانی یەکگرتوو و ستانداردمان بۆ ساز نەبووە، بەڵکوو هێشتا شێوەی ستانداردی سۆرانی دیاری نەکراوە و هەرکەس بەسەلیقە و ئارەزووی خۆی لە زمانی کوردیدا تێکەولێکە ئەکات و ئەم هەڵە نارەوایانە بە تایەبەت لە کاتی نووسینی کوردی بە پیتی لاتیندا زەقتر و بەرچاوترن و بە پێی بەڵگە و نووسراوە، ئەیسەلمێنین کە تەنانەت هەندێ لە پسپۆڕ و زانا و نووسەرەکانی کوردستانی عێراق لە پەرتووک و نووسراوەکانی خۆیاندا تووشی هەڵە و لارەڕێ یی وێژەیی بووون. شایانی باسە دوو شێوە زمانی بانەیی و سلێمانی سەدەی ٩٥ لە یەکتر ئەچن بەڵام هەرواکە وتمان گەلێ جار هەڵەکانی شێوەی بانەیی لە چاو شێوەی زمانی سلێمانی کەمترە و لە بەشەکانی

داهاتوودا باسی لەسەر ئەکەین و نموونە و وێنەکانی هەڵەی شێوە زمانی ئەم دوو شارەیش ئەخەینە بەر رەخنە و تاوتوێ و شیکردنەوە وشێوەی ئەردەڵانیش کە بەرەو توانەوە ئەڕوات و خەریکە وشە و رێزمانەکەی بەهۆی کارتێکرانی زمانی فۆڕمی ـ یەوە لە ناو ئەچێ، هەڵ ئەسەنگێنین.

ئەگەر سەیری نەقشە و جۆگرافیای ناوچە کوردنشیە سۆرانیەکان بکەین، بۆمان دەر ئەکەوێ کە شار و شێوەی زمانی بانەیی تا رادەیێ لە ناوەندی مەڵبەندە سۆرانیەکاندا هەڵکەوتووە و هەروا کە باسمان کرد، شێوەی ناوبراو بۆ سنە و ناوچەی ئەردەڵان و تەنانەت بۆ هەموو کوردە سۆرانیەکان پەسەندکراوترو و لەبارترەو لە باری فۆنێتیک و دەنگناسی‌یەوە رەوانتر و لەگەڵ شێوەزمانی خەڵکی زۆر شاردا وەکوو سەقز، مەریوان، سنە، سلێمانی، چوارتا، هەڵەبجە و شارەزوور، پێنجوێن و شلێر، دیواندەرە، ناوچەی گەورک، کەرکووک، چەمچەماڵ، کەلار، ماوەت، رەوانسەر، جوانرۆ، دەربەندیخان، کامیاران، قوڕوە و ... هتد لە باری دەنگناسی و وشە و زۆر تەوەر و دیاردە و بابەتی‌ترەوە فرەتر یەکتر ئەخوێننەوە و ئەتوانین بڵێین بێجگە لە وێژەیی بوونەکەی، لەگەڵ شێوەی زمانی خەڵکی شارەکانی کرماشان و ناوچە **کەلوڕ**نشین، **لەک** نشین و **فەیلی** نشینەکاندا سازگارتر و خاوەن تەبایی‌ترە و بۆ دانیشتووانی ئەو هەرێمانە دڵنشین و رەوانترە و ئەمانەیش وەک دیاردە و تەوەر و بابەتەکانی تر ئاماژەیان بۆ ئەکەین و بە پێی زانیاری و زانستی زمان، ئەیانخەینە بەر باس و لێکۆڵینەوە و شیکردنەوە و لەگەڵ یەکتردا ئەیاننووسین و هەڵیان ئەسەنگێنین.

پێویستە ئەمەیش بڵێین کە دیاری کردنی سێ شار و ناوچەی سلێمانی ، بانە و گەورک و فەیزوڵابەگیی بۆکان نابێ ببێتە هۆی ئەوە کە ئیتر لە شێوە و زاراوەکانی تر کەڵک وەر نەگرین . زۆر وشە و ئایدیۆم لە ناوچەکانی تردا هەن کە رەنگە لە سلێمانی و بانە و زۆر جێگە وناوچەی تردا بە دەگمەن دەست بکەون و بۆی هەیە جارجار وشەگەلێکی زۆر ویژەیی لە گوندێکی چکۆلەی دوورکەوتوودا لە زمان و دەمی دانیشتووانیەوە ببیسرێت کە لە شار و ناوچە و مەلبەندە بەربڵاوەکاندا هەرگیز نەبیسرابێت .

شایانی باسە لەوانەیە هەندێ کەس بیریان بچێت بۆ ئەوە کە بڵێن رەنگە ئەم نووسەرە وردەواڵەفرۆش یا چەرچی بووبێت و ئەم شوێنە ناوبراوانە گەڕابێت، بەڵام ئەبێ بڵێم من لە کوردستانی باشووریدا تەنیا بۆ ماوەی کورت، بۆ سلێمانی، چوارتا و پێنجوێن چووم و لە موکریانی ئێراندا دوو شەو لە مەهاباد و سێ جاریش لە شاری بۆکان بوووم. هەروەها سەرم لە سنە و کرماشانیش داوە و ماومەتەوە و لە سەردەمی شادا لە کرماشان ساڵ و نیوێک و لە سنەش لە سەردەمی شا و دوای شا بەتێکڕا چوار مانگ ماومەتەوە و چەند جار سەرم لە سەردەشتیش داوە و ئیتر بۆ زانیاریەکان زۆرتر لە بیر و بۆچوون و هەستی خۆم کەڵکم وەرگرتووە.

بە هیوای سەرکەوتن

## هەڵسەنگاندنی شێوە و زاراوەی وێژەیی و ستانداردی سۆرانی لەگەڵ شێوەی موکریانی و شێوەکانی تردا لە باری رێزمانەوە.

شێوەی موکریانی و هەولێر و دەوروبەری، لە باری ڕێزمانەوە لە چاو شێوەی وێژەیی و ستانداردی سۆرانی (کرمانجیی باشووری)دا هەڵەی زۆری تێدایە و ئەگەر لەگەڵ یەکتردا هەڵیانسەنگێنین، واتاکانیان ئەگۆڕێت.

لە موکریانیدا، چاوگ یا ریشەی کار و کردەوە(مصدر)ی بینین و دین، بریتی‌یە لە (دیتن) و شەش کەس بکەری (تاق) و (کۆ) بۆ کاری رابووردوو بەم شێوە لەگەڵ ئەو کارەدا ئەلکێنرێن، واتە سەرەتا بەشێ لە کاری (دیتن) وەک قەدی چاوگ کە ئەبێتە (دیت) ئەوترێت و ئەنووسرێت، لە دواییدا راناوی لکاو (ضمیر متصل) ئەنووسرێت.

### هێلکاری

| کەسەکان | موکریانی | ستاندارد، بانە ، سلێمانی |
|---|---|---|
| یەکەم کەسی تاقی ئامادە | دیتم | بینیم – دیم |
| دووەم کەسی تاقی بەرەوروو | دیتت | بینیت – دیت |
| سێیەم کەسی تاقی بزر | دیتی | بینیی – دیی |
| یەکەم کەسی کۆی ئامادە | دیتمان | بینیمان – دیمان |
| دووەم کەسی کۆی بەرەوروو | دیتتان | بینیتان – دیتان |
| سێیەم کەسی کۆی بزر | دیتیان | بینییان – دییان |

لێرەدا پیتگەلی (م) و (ت) و (ی) و (مان) و (تان) و (یان) لە شێوەی موکریانیدا راناوی لکاوی بکەر (فاعل)ن کە لە دوای قەدی چاوگی (دیت)دا ئەنووسرێن و

ئەوترێن و بەپێچەوانەی شێوەی ستاندارد و بانە و سلێمانی یە کە راناوەکان لە دوای قەدی چاوگی (دی – بینی)دا ئەوترێن، بەڵام لە ڕێزمانی شێوەی ستاندارد و ویژەیی و شێوەی بانە، سلێمانی و بابان و تەنانەت ئەردەڵان و هەندێ ناوچەی تردا ئەو واتایە نادەن کە لە موکریانیدا ئەیدەن و ئەمەیش تابلۆیێکی تر کە تێیدا واتای هەندێ ناوچە وەک ئەردەڵان، بانە و سلێمانی لەگەڵ موکریانیدا هەڵئەسەنگێنرێن و تەنانەت شێوەی گەرمیانیش لەگەڵیدا جیاوازیی هەیە:

| موکریانی – چاوگی دیتن<br>(م) و (ی) و ... راناوی لکاوی بکەرن | بانە و سلێمانی<br>(م) و (ی) راناوی لکاوی بەرکارن | ئەردەڵان و گەرمیان<br>(م) و (مان) و (یان) راناوی لکاوی بکەرن. پیتی (ت) راناوی لکاوی بەرکاری دووەم کەسی تاقی بەرەوڕووە |
|---|---|---|
| دیتم ( من ئەوم بینی) | دیتم (تۆ منت بینی) | دیتم (من تۆم بینی) |
| دیتی ( ئەو ئەوی بینی) | دیتی (ئەو تۆی بینی) | واتای نیە |
| دیتمان(ئێمە ئەومان بینی) | واتای نیە | دیتمان (ئێمە تۆمان بینی) |
| دیتیان (ئەوان ئەویان بینی) | واتای نیە | دیتیان (ئەوان تۆیان بینی) |

بێجگە لەمانە، ئەبێ بڵێین کە چاوگ (مصدر)ی دیتن، کار و کردەوەی ئێستا و داهاتوو (رانەبووردوو)ی نیە. ئەگەر لە راستەقینەدا لە شێوەی موکریانیدا بڵێین ئەبینم (کاتی ئێستا و داهاتوو)، ئەبێ بڵێین دەدیم یا دەدیتم، بەڵام ئەمەیان نیە و بە ناچاری لە چاوگی (بینین) کەڵک وەرئەگرن و ئەڵێن دەبینم، دەبینی، دەبینێ و ... هتد کەواتە، چاوگی دیتن هەڵە و کەم و کووڕ و ناوێژەیی یە و ئەبێ لە چاوگی بینین کەڵک وەرگرین و لە شێوەی بانەییدا لە هەردوو چاوگی بینین و دین کەڵک وەر ئەگرن بەڵام لە سلێمانی زۆرتر لە بینین کەڵک وەر ئەگرن. کە واتە ، شێوەی

سلێمانی بۆ چاوگی ناوبراو(بینین) وێژەیی ترە. لێرەدا ئەم ڕاستەقینەمان بۆ دەرئەکەوێ کە زمانی فارسییش لە پەیوەندی لە گەڵ کردەوە و کاری بینیندا کەم و کووڕیی هەیە چونکە لە فارسیدا لە چاوگی (دیدن) کەڵک وەر ئەگیرێت وەک: دیدم، دیدی، دید ... . ئەمانە بۆ کاتی ڕابووردوون، بەڵام بۆ کاتی ئیستا (حال) ئەوانیش وەک موکریانی ناچارن لە چاوگی بینین کەڵک وەرگرن و چاوگی دیدن کاتی ئیستا (حال)ی نیە وەک: می بینیم، می بینی، می بینید و ... هتد. هەروەها بۆ فرمان و داخوازی و ئەمریش لە چاوگی بینین کەڵک وەر ئەگرن وەک: ببین، ببینید، ببینند.

## سێ یەم کەسی تاقی بزر

لە شێوەی موکریانیدا بە تایەبەت لە شێوەی ناوچەی سۆران (هەولێر)دا وەک شارەکانی شنۆ، پیرانشار و شارەکانی پارێزگەی ناوبراو، بۆ ڕاناوی لکاوی سێیەم کەسی تاقی بزر کە نیشانەکەی (ێ) یا (ێت)ە، بە هەڵە نیشانەو پیتی (ی) بە کار ئەهێنرێت. بۆ وێنە و نموونە ئەگەر بڵێن ئەسرین ئەچێتەوە بۆ فێرگە، ئەڵێن: ئەسرین دەچیتەوە بۆ فێرگە. بەلاتین بەم چەشنە ئەنووسرێن:

بانە و سلێمانی و زۆر ناوچەی تر: (وێژەیی) esrîn eçêtewe(deçêtewe) bo fêrge

شنۆ، دەڤەری هەولێر و هتد، ...(هەڵە) esrîn deçîtewe bo fêrge

واتە، لە جیاتیی ê، پیتیî بەکار ئەهێنن و ئەمەیش لە باری ڕێزمانەوە هەڵەیە

چونکە لە باتیی نیشانەی راناوی لکاوی سێ یەم کەسی تاقی بزر، راناوی لکاوی دووەم کەسی تاقی بەرەوروو(مخاطب) بەکار ئەهێنن.

## (ئەمە) و (ئەوە) ـ (ئەمانە) و ( ئەوانە )

لەڕێزمانی وێژەیی و ستانداردا، نیشانەکانی ئاماژە بۆ نزیک و دوور، ئەمانەن:

بۆ مرۆڤ و شت و گیان لەبەر و ئاژەڵ و پاتاڵ و دەعبا کە ناسراو (معرفه) بێت:

ئەمە (بۆ نزیک – تاق) ئەوە (بۆ دوور– تاق)

ئەمانە(بۆ نزیک – کۆ) ئەوانە (بۆ دوور – کۆ)

بۆ مرۆڤ و شت و گیان لەبەر و ئاژەڵ و پەتاڵ و دەعبا کە نەناسراو (نکره) بێت:

ئەم (بۆ نزیک – تاق) ئەو (بۆ دوور – تاق)

ئەمان (بۆنزیک – کۆ) ئەوان (بۆ دوور – کۆ)

بەڵام لە موکریانیدا نیشانەی ئاماژە بۆ نزیکیان نیە و لە جیاتیی **ئەمە**، ئەڵێن **ئەوە**، واتە بۆ ئاماژە بۆ نزیک، نیشانەی دوور بەکار ئەهێنن و بۆ ئاماژە بۆ دوور، (هەو) بەکار ئەهێنن، واتە ئەگەر بڵێن ئەمڕۆ، ئەڵێن ئەوڕۆ و ئەگەر بڵێن ئەم منداڵە ئەڵێن ئەو منداڵە و بۆمان دەرکەوت کە لەباری ڕێزمانەوە هەڵە و ناوێژەیی و ناستانداردن. ئەگەر بڵێن ئەو رۆژە، ئەڵێن ئەوی رۆژێ. ئەگەر بڵێن هیی ئەوە، ئەڵێن ئی ویە.

## راناوای لکاوی کۆی (تان)

له موکریانیدا بەتایەبەت له موکریانی ئێراندا راناوی لکاوی دووەم کەسی کۆی بەرەورووویان نیە، واته ئەگەر بلێین نانتان خواردووە، ئەلێن نانوو خواردووە، واته له جیاتیی (تان) که نیشانەی راناوی لکاوی دووەم کەسی (کۆ)ی (مخاطب)ە و زۆرجار لەگەڵ فارسیدا تێیدا هاوبەشین، پیتی (و) یان دووپیت و نیشانە(وو) بەکار ئەهێنن.ئەمەیش هەڵسەنگاندنێکی شێوەی وێژەیی و ستاندارد لەگەڵ شێوەی موکریانیدا:

| وێژەیی و ستاندارد | موکریانی |
|---|---|
| ئەمڕو پارەتان ئەدەنێ | ئەوڕۆ پارەو دەدەنێ |
| سپاستان ئەکەن | سپاسوو دەکەن |
| نانتان هەیە | نانوو هەیە |
| ئەتاندەنێ | دەودەنێ |
| ناشتاتان کردووە؟ | ناشتاو کردووە؟ |

# شێوەی موکریانی و بەرکار (مفعول)

لە موکریانیدا لە کاتی ئەنجامدانی کارێکدا بۆ چەند جار و دووبارەکرانەوەی ئەوکارە، لە کاتی بەکارهێنانی بەرکاردا، بە هەڵە پیتی (م) ئەلکێنرێت بە وشەگەلی (جار) و (بار) و (کەڕەت)ەوە و بۆ وێنە بە چەشن و شێوەی لاپەڕەی دوایی ئەنووسرێت و ئەوترێت:

ئەوڕۆ دوو جارم ناشتا خواردووە. واتە ئەبێ راناوی لکاو بە بەرکار (مفعول)ەوە بلکێنرێت کە ئەمەیش هەڵەیە.

هەڵسەنگاندن:

ئەمڕۆ چووم بۆ بارخانە و دووجارم کەل و پەل هێنان (موکریانی)

ئەمڕۆ چووم بۆ بارخانە و دوو جار کەل و پەلم هێنا (ستاندارد)

یا لە هەندێ رستەی تردا کە لە چەشنێ هەواڵی بێت، وەک:

زۆرم لاق دێشێ = موکریانی

قاچم – پێم (لاقم) زۆر ئێشێ یا دێشێ = ستاندارد و وێژەیی.

واتە نابێ راناو بلکێنرێت بە بەرکارەوە.

بەڵام لە رستەیێکدا وەک: زۆرم تینووە، ئەمە وێژەیـــی‌یە، چونکە تینوو بەرکار نیە بەڵکوو ئاوەڵناو (صفت)ە و هەم ئەتوانین راناو بلکێنین بە وشەی (زۆر)ەوە و هەم بە وشەی تینووەوە، چونکە هەردووکیان ئاوەڵناون نەک بەرکار.

## هاتوو چوو (هات و چوو)

لە شێوەی وێژەیی و ستانداردا، بۆ هەندێ کار و کردەوەی لێکدراو (مرکب) وەک **هاتوو چوو**، هەر دوو کار وکردەوەکە لە رابووردوودایە. گەرچی (هات) و (چوو) بۆ خۆیان چەشنی ناوی چاوگ (اسم مصدر)ن، لە زمانی فارسیدا هەر وەک کوردی هەردوو وشەکە لە رابووردوودا ئەنووسرێن وەک: (آمدوشد) و (آمدورفت) و هەردوو وشەکان وەک کاری رابووردووی یەکەم کەسی تاقی بزرن و لە کوردیشدا هەر وایە، واتە: (هات) و (چوو). بەڵام بەداخەوە لە هەندێ ناوچەی موکریان و شێوەی سۆران و پارێزگەی هەولێردا ئەڵێن (هاتووچۆ) و لاتینەکەیان بەم شێوەیە:

هاتووچوو (ستاندارد و وێژەیی) Hatūçū

هاتووچۆ (هەولێر و سۆران) Hatūço

بەداخەوە ئیستا تیلیویزیۆنەکان و تەنانەت نووسەران و وەرگێڕەکانی خەڵکی سلێمانی، زۆربەیان ئەڵێن و ئەنووسن هاتووچۆ و ئەمە بەتەواوی هەڵەیەو وێژە و رێزمانی کوردی بەم چەشنە کارانە پێشێل کراوە و بەتایبەت لەو کاتەوە کە هەولێر کراوە بە پێتەختی کوردستان، ئەم کارە پەرەی سەندووە. بەڵام پێویستە بڵێین ناوچەی موکریانی ئێرانیش لەم هەڵەیە بە دوور نیە و خەڵکی موکریان بەتایبەت لە دەوروبەری شنۆ و پیرانشار ئەڵێن و ئەنووسن هاتووچۆ.

ئەبێ بەرپرسەکان لە کوردستانی عێراق یا باشووردا ئامۆژگاری و رێنوێنیی ئەو کەسانە بکەن کە بە هەڵەدا چووون و بۆ (مرور) و (تردد)ی عەرەبی، هاتووچۆ

بەکار نەهێنن چونکە ئامێرە پەیوەندییە گشتی یەکان واتە رادیۆ، تیلیویزیۆن و چاپەمەنیەکان وەک رۆژنامە و گۆڤار، زۆریان ئەلێن و ئەنووسن هاتووچۆ و لە ئاکامدا لەم چەند ساڵی دواییانەدا کاری نێگەتیڤی کردووەتە سەر شێوەی سلێمانی و ناوچە و مەڵبەندەکانی تر. شەوی ١٤ لە سەر ١٥ی نوڤامبری ٢٠٠٨ تیلیویزیونی کوردسات لە بارەی هات و چووی نێوان ئێران و عێراق بە پاسپۆرت و پەیوەندی لە ڕێگای پێنجوێن و باشماخەوە، لە بەشی هەواڵەکاندا وتی هاتووچۆ و بە پیتی لاتین نووسیبووی:Hatūço . تەنانەت لە سەر ئۆتۆمۆبیلی پۆلیسدا ئەنووسن **هاتووچۆ**. لە بەشەکانی داهاتوودا نموونەی‌تر ئەهێنینەوە.

١٦ ساڵ لەمە پێش کورتە چیرۆکێکی ئینگلیسیم کە وەرمگێڕابووەوە سەر زمانی کوردی، نارد بۆ ورمێ بۆ لە چاپدران لە گۆڤاری سروە دا کە لە راستەقینەدا لە ساڵی ١٩٧٥ی زایینی (١٣٥٣- کۆچی – هەتاوی)دا وەرمگێڕابووەوە و ناوی (تۆڵەی رۆلە) بوو.بەرپرسەکان بێجگە لەوە کە وشەی ڕۆڵەیان لابردبوو و تۆڵەیان لە ژێر سەلکە سەگێکدا نووسیبوو و زۆرکەس بە توڵە سەگی ئەخوێندەوە، لە ناو دەقی وەرگێڕاوەکەدا وشەی (هاتووچوو)یان گۆڕیبوو و بە شێوەی موکریانی و سوران نووسیبوویان هاتووچۆ.

تەنانەت لە کوردستانی باکوریدا ئەلێن هاتن و چوون و هەروەها لە ئەردەڵاندا هات و چوون بە کار ئەهێنرێت. چۆ (لەهجە)یە نەک وێژەیی.

## نیشانەی کۆ (جمع)

لە شێوەی موکریانیدا لە باتیی کۆ، وشەی (خڕ) بەکار ئەهێنرێت و ئەمەیش لەباری زانیاری و رێزمانەوە هەڵەیە چونکە خڕ واتای (گرد) ئەدات، وەک خڕەبەرد، خڕۆکەی خوێن(گۆلۆبوول)، بەڵام وشەی (کۆ) وێژەیی یە، وەک: کۆمەڵ، کۆگا، کۆم (کوردیی باکووری)، کۆزەکار(جێگەی راگرتنی ئاژەڵ و پاتاڵ)، کۆزی بەرخەل. تەنانەت لە زمانگەلی ئینگلیسی و فەرانسەییدا زۆر وشە هەن کە رەنگە لە کۆنەوە لە گەڵ زمانی کوردیدا لە یەک ریشە و بناخە و بنەڕەتدا بوویێتن و هەموویان پێشگری (کۆ –Co)یان هەیە وەک: , co-ordination , commity conference , collaboration , .cooperation , commission , community , company , collection

دیارە کوردی لە زمانەکانی هیندوئورووپاییە و ئەمڕو ئاوا ماوەتەوە و وشەگەلی ناوبراو واتاگەلی وەک کۆمەڵ، کۆگا، کۆبوونەوە، هەرەوەزی (کاری بە کۆمەڵ) و ... ئەدەن کە واتای(پێشگر)ی co، هەر (کۆی) کوردی یە کە لە ناوچەگەلی بانە، سلێمانی و چوارتا، پێنجوێن، شارەزوور و هەندێ جێگەی تر قسەی پێ ئەکەن و بەکاری ئەهێنن و کەڵک وەرگرتن لە (خڕ) بۆ ئەم وشە و فرەیز و ئایدیۆم (ئیستلاحات)ە وێژەیی نیە. بۆ نموونە ئەگەر چاوگی خڕبوونەوە بەکار بهێنین، واتای کۆبوونەوەی وێژەیی نادات.ئێمە هەندێ وشەی باشی کوردیمان هەیە کە ئەگەر بەچەشنی لێکدراو کەڵکیان لێوەرگرین، واتای وێژەیی و زانیاری ئەدەن،

وەک: ملەخرِە (نەخۆشیی ئۆرِیۆن). بەڵام هەندێ وشەی لێکدراوی تر هەن کە لە موکریانیدا گۆرِانیان بەسەردا هاتووە، وەک: (خرمان) کە لە موکریانیدا ئەڵێن خەرمان. خرمان دروست ترە چونکە لە دوو وشەی (خرِ+مان)ەوە پێک هاتووە و چونکە ئەو جێگە کە خرمانی لێ دروست ئەکەن و خرمانی لێ هەڵ ئەگرن گردە، واتە خرِە و بە چەشنی بازنە(دایرە)یە و پاشگری (مان) کردوویە بە ئاوەڵکاری جێگە (قیدمکان) وەک نیشتمان. بۆ سەلماندنی ئەم راستی یە، ئەتوانین باسی وشەی خرخاڵ بکەین کە لە شێوەی زمانی ئەردەڵاندا واتای بازنەی دەست ئەدات و وشەی (خر) هەر (خرِ) بووە. هەروەها وشەگەلی خرپن، خرت، خرچە کە هەموویان خاوەنی پیتی (ر)ی خرمانن و واتای خرِ و گرد و خرِوخۆل و هتد ... ئەدەن.

## پاشگری (وە) یا (ەوە)

پاشگری ناووبراو واتای زۆری هەیە و ئەگەر لە گەڵ کارو کردەوە (فعل) یا لە گەڵ ناوی جێگە و زۆر وشەی تردا بنووسرێت یا بوترێت، واتای وشەکە ئەگۆرِێت. یەکێ لە واتا و کارەکانی پاشگری (وە) بریتی لە دووبارەکرانەوەی کار، وەک: هاتمەوە واتە رۆیشتووم دیسان هاتووم. یەکێکی تر لە ئەرک و کارەکانی پاشگری ناوبراو، ئەوەیە کە ئەگەر لە رستەییێکدا وەک: لە تارانەوە هاتم بە کار بهێنرێت نیشانە و ئامرازی ئەوە ئەگەیێنێ کە لە جێگە و شوێنێکەوە هاتم و بۆ ئەم

کاره، پرێپۆزیشنی (له) ئەنووسرێت ئەمجار جێگاکه و ئەمجار پاشگری (وه)یا (ەوه) ی پێوه ئەلکێنرێت، بەم چەشنە:

له + ناوی جێگا + ەوه. وەک:

له فێرگەوه بەپێ هاتمەوه. له + فێرگە+ وه ...

هەروا ئەتوانین پاشگری ناوبراو بلکێنین به ئاوەڵکاری کاتەوه، وەک:

له دوێنێوه نەخۆش کەوتووم

له پارەکەوه تۆم نەبینیوه (تۆم نەدیوه)

پرێپۆزیشنی (له) واتای (از)ی فارسی و (من)ی عەرەبی و (from)ی ئینگلیسی (ژ)ی کوردیی باکووری و (جه)ی هەورامی ئەدات. له موکریانیدا زۆر جار ئەم پاشگره بەکار ناهێنرێت و له باتیی ئەمه، پاشگر یا وشەی (را) بەکار ئەهێنرێت واته ئەگەر بڵێن له تارانەوه هاتووم، ئەڵێن له تارانێ را هاتووم. دیاره له لای ئێمه، راهاتن واتای پەروەردەکران و فێرکران و خووپێگرتن ئەدات. ئەگەر له بانه، سلێمانی، و سەقز و زۆرشاری تردا بڵێین له تەورێز راهاتووم، واته له تەورێز فێر و پەروەرده کراوم یا خووم گرتووه.

ئەڵبەت له زۆر شاری تردا پاشگری (وه) کورت ئەکرێتەوه و ئەکرێ به (ۆ) وەک: هاتمۆ واته هاتمەوه (شێوەی سەقز). هاتمەو (شێوەی ئەردەڵان) که پاشگری (ەو) به کار ئەهێنرێت.

هەڵسەنگاندن:

له تارانۆ هاتمۆ(شێوەی سەقز)

له تارانه‌و هاتمه‌و (شێوه‌ی سنه و ئه‌رده‌ڵان)

له تارانه‌وه هاتمه‌وه (شێوه‌ی بانه، سلێمانی و ستاندارد)

ژ ته‌هرانێ هاتم (ژ ته‌هرانێ وه هاتم) (شێوه‌ی باکووری)

جه تارانی ئامامه‌وێ (شێوه‌ی هه‌ورامی)

وه تێهران هاتم (شێوه‌ی که‌لوڕی و له‌کی)

له تارانێ راهاتم (شێوه‌ی موکریانی)

له حه وزێ که وتم (موکریانی) – که وتمه حه وزه وه (وێژه یی و ستاندارد)

**لەزمانی کوردیدا چەند چاوگ و وشە و ئایدیۆم (اصطلاح)ی دارێژراو و لێکدرواومان هەیە کە رەنگە زۆر کەس لە رووالەتداوا تێ بگەن کە هەموویان یەک واتایان هەیە ؛**

**وەک:**

## هاویشتن، خستن، فڕەدان، تووڕهەڵدان و هەڵخستن.

**بەڵام هەرکام لەمانە واتای تایەبەت و جیاوازیان هەیە: هاویشتن بۆکار و کردەوەییێک ئەبێ کە ئەنجامدانەکەی کەوانی و قەوسی و بۆ دوور بێت وەک: بەردهاویشتن. هەروەها بۆکاری زۆر دوور و ئامێری دوورهاویژیش ئەبێت، وەک:**

**خومپارە هاویژ کە بە عەرەبی پێی ئەڵێن هاوەن و بە ئینگلیسی پێی ئەڵێن (مۆرتار) یان (مۆرتاڕ لاونچر). چونکە گوللەی هاوەن یا خومپارە بە شێوەی قەوسی و کەوانی و بۆ دوور ئەڕوات و دوور هاویژە. لە موکریانیدا لە کاتی بەکار هێنانی وشەی هاویشتندا بەهەڵە، بۆ کاری یەکجار نزیک و ناکەوانی و ناقەوسی ئەیلێن وەک ئەمە کە ئەگەر بلێن پارە(پوول)ە کەم خستە ناو گیرفانم یا بلێن پارەکەم نایە ناوگیرفانم، ئەڵێن پارەکەم لە گیرفانێ هاویشت و ئەمە هەڵەیە. یا ئەگەر پەرداخ یا ئاوەخۆرێکی گەورەی پڕ لە ئاوی شووشەیی دانرابێت و بلێن لەو لاوە داینێ یا ئەگەر بلێن بینێ ئەولاوە، ئەڵێن بیهاوە ئەولای. جا ئەگەر ئەم پەرداخە یا ئەم ئاوەخۆرییە (لیوان)ە شووشەییە بهاویژرێت، هەم ئەشکێت و هەم ئاوەکەی ناوی ئەرژێت چونکە هاویشتن بۆ ماوەی دوورە. ئەبێ بلێین (بینێ ئەولاوە) یان،**

لەولاوە داینێ یان لانی کەم ئەبێ بڵێین بیخە ئەولاوە.

ئایا نێوان دەست و گیرفان کە ٢٠ سانتیمیتر نابێ، بۆ چی ئەبێ بڵێین لە گیرفانێم هاویشت؟ دروستەکەی ئەمەیە کە ئەبێ بڵێین نامە گیرفانم یا لانی کەم بڵێین خستمە گیرفانم، نەک هاویشتمە گیرفانم و لە گیرفانێم هاویشت و هتد...

وشە و کاری خستن بۆ نزیکەی نیومیتر تا چەند میتر یا چەندین میتر بە کار ئەبرێت وەک: خستمە ناو گیرفانم، خستمە ئەولاوە، خستمە سەر تاقەکە، خستمە سەر تێلێویزیۆنەکە، خستمە ناو داڵانەکە. ئەو کراسەم بۆبخە! ئەو کەلوپەلەم لە ناو ماشینەکەدا بۆ بخە خوارەوە! ئەو پانتۆڵەم لە پەنجێرەکەوە بۆ بخە خوار.

فڕەدان (فڕ + رادان)

لە موکریانیدا ئەڵێن فڕێدان و ئەمەیش هەڵەیە چونکە ئایدیۆمەکە چاوگی دارژاوە و لە دوو وشەی (فڕ) و (رادان)ەوە پێک هاتووە واتە بە شێوەیێک بیخەی کە بە چەشنێ هەست بکەی کە دەنگی (فڕ)ی لێوەبێت و (رادان) بۆ کاری موازی و هاوئاست لە گەڵ زەوی و ئاسۆیی (افقی) یە. فڕ واتە دەنگی شتێ کە بە هۆی خێرایی یەوە لە هەوا بدرێت وەک فڕفڕە، فڕۆکە، هەڵفڕینی پەلەوەر، فڕکە.

رادان وەک: رادانی ئاو بە گسک، راخستنی نوێن و جێگەوبان و فەرش، راکێشان، رامالین،راکردن،راگرتنی ماشێن و سەییارە، راونان، راوەستان، راپەڕین، راوەشان.

توور هەڵدان هەر (دوور هەڵدان) بووە و بەگوێرەی رۆژگار گۆڕاوە و لە بنەڕەتدا (دوور + هەڵدان) بووە، واتە کارێک کە شتێ فڕە بدەیت و بە شێوەی کەوانی هەڵی بدەیت بۆ دوور .

لە موکریانیدا بۆ ئەم سێ ئایدیۆم و چاوگە دارژاوانە، ئایدیۆمی لێ گەڕان بەکار ئەهێنن. لە سلێمانی و سنە و ئەردەڵاندا زۆرتر وازلێهێنان بە کار ئەهێنرێت.

لە بانە زۆرتر لێ کەوتنەوە و لە کۆڵ کەوتنەوە و جارجار وازلێهێنان بەکار ئەهێنرێت. لە موکریاندا (لێ گەڕان) بە کار ئەهێنرێت وەک: (لێم گەڕێ) واتە وازم لێ بێنە یا لە کۆڵم وەکەوە یا لێم وەکەوە، بەڵام لە شێوەی ناوبراودا (موکریانی) ئایدیۆمی لێگەڕان بۆکار و کردەوەی تریش بەکار ئەهێنن وەک: دوو رۆژە لێت دەگەڕیم، لە پارەکەوە هیوا لێت دەگەڕێ. لێرەدا مەبەست لە لێگەڕان، بەشوێندا گەڕان و بەدوادا گەڕانەو ئەمەیش نیشانەی کەم و کووڕیی زمانە چونکە نابێ یەک ئایدیۆم بۆ دووکار کەڵکی لێوەربگیرێت. شایانی سەرنجە کە لە موکریانیدا لە-جیاتیی دواکەتن و راونان، ئەڵێن راوە دوونان و لێرەدا وشەی دوو هەروەک ژمارەی دوو (٢) ئەوترێ و ئەنووسرێ و ئەمەیش هەڵەیە چونکە بۆ نموونە، وشەی (دواکەوتوو) ناکرێت بە (دوو کەوتوو) بوترێ و لە شێوەی موکریانیدا وشەی پێشگری (دوا) لە چاوگ و ئایدیۆمی دارژاوی (دوانان) ئەکرێت بە دوونان و هەروەها وشەگەلێ وەک رەدووکەوتن واتە شوێن کەوتن و دوای کەسێ کەوتن. لە کوردیی وێژەییدا ئایدیۆمەکانی ناوچەگەلی موکریان و سۆران و دەوروبەری هەولێر هەڵەن. لە کوردیی وێژەییدا شوێنهەڵگرتنیش بەکار دێت، واتە بە ئاسەوار و شوێنەواری کەسێک یا شتێکدا چوون، بە مەبەستی دۆزینەوەی جێگاکەی یا بۆ راوکردنی کەروێشکێک یا رێوی و ... هتد.

## دۆزینەوە

ئەگەر شتێک ون ببێ و دیسان بەدەستی بهێنینەوە، بەو کارە ئەڵێن دۆزینەوە. هەروەها بۆ بەدەست هێنانی بەرهەم و بنەما و دیاردە و شتێ کە بۆ ژیانی مرۆڤ گرنگایەتیی هەبێ. نموونە: ئەنگوستیلەکەم دۆزیەوە. پسپۆڕەزەوی ناسەکان لە باکووری عێراقدا نەوتیان دۆزیەوە. واتە شتێ کە ون و بزر بووبێ و دیسان بەدەستی بهێنیتەوە یا شتێکی گرنگ کە بۆ ژیانی مرۆڤ بە نرخە، دۆزرابێتەوە.

لە موکریانیدا بۆ دۆزینەوە دوو کردەوە و وشە و چاوگی (دیتنەوە) و (بینینەوە) و (دینەوە) بەکار ئەهێنرێت و ئەمەیش هەڵەیە چونکە دۆزینەوە بریتی‌یە لە کارێک کە بە مەبەست و بەنیاز(تصمیم) و لێبڕاوانە بە دوای شتێکی لە دەستچوودا بڕۆیت کە ون بووبێ یا بە دوای شتێکدا بڕۆی کە بە ئامانج و بەوتەی فارسی بە ئەنگیزەوە بۆی بگەڕێیت، بەڵام دیتنەوە و بینینەوە بەڕێکەوت و سودفە و تصادف و بێ‌ئامانج روو ئەدەن. دۆزینەوە ئامانج و بەدواداچوونی پێوەیە. کەواتە، دیتنەوە و بینینەوە هەڵەن، با سەیری ئەم رستانە بکەین:

موکریانی: کاتژمێرەکەم دیتەوە (بینیەوە) یا (دیەوە).

بانە و سلێمانی: کاتژمێرەکەم دۆزیەوە (وێژەیی)

سەقز و زۆرجێگا و شاری تر: کاتژمێرەکەم دۆزیۆ (کورتکراوی دۆزیەوە).

بەڵام لە ناوچەی ئەردەڵاندا گەرچی تا ئەم دواییانە وشەی دۆزینەوەیان بەکار ئەهێنا، ئێستا بەهۆی کارتێکردنی زمانی فۆڕمی‌یەوە، زۆرجار خەڵکی ئەو ناوچەیە

له وشه و چاوگی پەیداکردن کەڵک وەر ئەگرن، واتە ئەڵێن: پەیام کرد.

بەڵام له رابووردوودا ئەیانوت دۆزیمەو. هیشتا زۆر کەسیان ئەڵێن دۆزینەوە، بۆ وێنه ، ئەڵێن چتەکەم دۆزیەو ، واته شتەکەم دۆزیەوە.

## چاولێکه ری (چاولێکردن)

له موکریانیدا بۆ کاری تماشاکردن و روانین و سەیرکردن، له ئایدیۆم و چاوگی چاولێکردن کەڵک وەر ئەگرن. بۆ نموونه ئەڵێن: چاوم لێ کرد. چاویان لێ بکه. چاوی لێمەکه. بەڵام ئەمه هەڵەیه چونکه له شێوەی ستانداردی سۆرانیدا چاولێکردن و چاولێکەری واتای لاساکردنەوه و تەقلید و ئیقتدا ئەدات، بۆ نموونە:

ـ سۆما چاوی له کچی دراوسێکەیان کردووه و جلی وەک ئەوی له بەر کردووه.

ـ کوڕی دراوسێکەمان چاوی له رەفیقەکەی کردووه و فێری کردەوەی ناشیرین بووه.

کەواته بۆمان دەرکەوت که چاولێکەری واتای تماشاکردن، روانین و سەیر کردن نادات، بەڵکو ئایدیومێکی لاسکردنەوەیه و واتای تەقلید و ئیقتدا ئەدات. له کەرکووکەوه هەتا بانه و سەقز و سنه و شارەزوور و تەنانەت له سلێمانی و چوارتا، پێنجوێن و هەندێ له ناوچەکانی تری باشووری کوردستانی عێراق، چاولێکەری واتای لاسایی کردنەوه ئەدات. رۆڵه! تۆ چاو له کوڕی فیسارکەس مەکه. واته تۆ پەیڕەوی لەو مەکەو لاسای مەکەرەوه و ئیقتدای لێ مەکه. (کەواته، چاولێکەری و چاولێکردن واتای سەیرکردن و روانین و تماشای ئەو کردن نادات).

## خۆزگه ، بریا، شه ڵلا.

ئەگەر ئەم وشانە لە گەڵ کردەوە و کاری نزایی ودۆعاییدا بە کار بهێنرێن، بەمچەشنە ئەوترێن و ئەنووسرێن:

(لە کردەوەی رابووردوودا)

خۆزگە بچوومایێ

خۆزگە بمخواردایێ

خوزگە بهاتایێ

بریا بمدیایێ

شەڵلا بمانهێنایێ

ئەبووایێ بچوومایێ

بەڵام لە شێوەی موکریانیدا بەم چەشنە ئەوترێن و ئەنووسرێن:

خۆزگە چووبام

خۆزگە خواردبام

خۆزگە هاتبا

بریا دیبام

شەڵلا هێنابامان

دەبوو (دەبا) چووبام

دیارە لێرەیشدا شێوەی موکریانی هەڵەیە و تا ڕادەیێ لەگەڵ زمانی فارسیدا نزیکە.بۆنمونە لەهێڵکاری و تابلۆی لاپەڕەی دواییدا راناوی لکاوی(م)ی موکوریانی

لەگەڵ راناوی لکاوی (م)ی زمانی فارسیدا لە یەک جێگەدا وەک یەک هەڵ ئەسنگێنین.

**هەڵسەنگاندن:**

| شێوەی ستاندارد | شێوەی موکریانی | زمانی فارسی |
|---|---|---|
| بریا بمخواردایێ | بریا خواردبام | کاش خوردەبودم |
| خۆزگە بڕۆشتمایێ | خۆزگە رۆشتبام | کاش رفتەبودم |
| شەڵلا بمکوشتایێ | شەڵلا کوشتبام | کاش کشتە بودم |
| بریا بمردمایێ | بریا مردبام | کاش مردە بودم |

شایانی سەرنجە کە زۆرکەس تەنانەت نووسەران و هۆنەران و وەرگێڕان لە کوردستانی عێراق لە سلێمانی و کەرکووک و هەندێ شاری تر کە بە شێوەی ستاندارد ئەم کردەوە و وشانە بە کار ئەهێنن، زۆرکات تووشی هەڵە ئەبن و لەباتیی وشەی بمردمایێ، ئەنووسن بمردمایە. یا ئەگەر بنووسن بچووایێ، ئەنووسن بچووایە واتە لە جیاتی پیتی (ێ)، پیتی (ە) بە کار ئەهێنن و ئەمەیش زۆر هەڵەیە و نازانم کێ ئەڵێ وای بنووسن.

**هەڵسەنگاندن**

| هەڵە | دروست |
|---|---|
| بمخواردایە | بمخواردایێ |
| بدزرایە | بدزرایێ |
| بیانبردایە | بیانبردایێ |

ئەم چەشنە کەسانە، بەبێ هەستی لێپرسراوەتی، بە ویست و ئارەزووی خۆیان لەجیاتیی پیتی (ێ) پیتی (ە) ئەلکێنن بە دوایین بەشی وشەکەوە، ئەمەیش

نموونەی نووسین بە پیتگەلی لاتین بۆ سەلماندنی زەق بوونی هەڵەکە، چونکە زۆر جار هەڵەکان لە نووسینی لاتیندا دەرئەکەون، وەک هێڵکاریی خوارەوە.

**هەڵسەنگاندن:**

| پیتی عەرەبی | پیتی لاتین |
| --- | --- |
| دروست:<br>سەد بریا ئەو کارەساتەمان بەچاو نەدیایێ<br>هەڵە:<br>سەد بریا ئەو کارەساتەمان بەچاو نەدیایە | دروست:<br>Sed birya ew karesateman be çaw nedîayê<br>هەڵە:<br>Sed birya ew karesateman be çaw nedîaye |

واتە وشەی nedîayê دروستە و وشەی nedîaye هەڵەیە. هەندێ کەس لە جیاتیی نایێ، ئەنووسن نایە!! نازانم ئەمە کێ وای فێرکردوون. لە خۆیانەوە وا ئەنووسن. وشەکە و پیتەکە لە مێشکیانەوە نایێت، بەڵکوو تەنیا لە ناو پێنووس و قامکەکانیانەوە دەرئەپەڕێت. تەنانەت لە جیاتیی کایا، ئەنووسن (کایە) و خەڵکی تریش وا فێر ئەکەن و لە کۆندا هەر (کایا) بوو.

ئەم کارانە، تێکدەرانەن نەک سازەرانە و چاککارانە و بووونەتە هۆی ئەوە کە منداڵەکان لە فێرگەکاندا لە گەڵ هەڵەدا بەرەورِوو ببنەوە. گەرچی لە ناوچەگەلی سلێمانی، بانە، شارەزوور، سەقز، هەتا ئەگەینە ئەردەڵان و کامیاران و کرماشان و قەسری شیرین ،ئیلام و لەکستان زورجار پیتی(د) بە هەوانتەو خۆڕایی ئەخورێت و

لە ناو ئەچێت و لە زۆر وشەدا ئەکرێت بە پیتی (ی) یا پیتی (ا)، وەک ئەم هێڵکاری و رستانەی خوارەوە:

## هێڵکاری:

| دروست (موکریانی) | هەڵە (بانە، سلێمانی، ئەردەڵان، گەرمیان و...) |
|---|---|
| لێی بدە | لێی بە –لێی یە – (بە لێی –ئەردەڵان) |
| لێمداوە | لێمماوە |
| پەڵەی بارانی داوە | پەڵەی بارانی یاوە |
| دەیدەمێ (ئەیدەمێ) | ئەییەمێ- (ئەییەم پێی _ئەردەڵان) |
| خۆت لادە | خۆت لایە |
| قەنداو | قەنناو |
| بریندار | برینار |
| ئاگادار | ئاگایار |
| هتد ... | هتد ... |

هەڵە و کەم و کوورِیی شێوەی سلێمانی و بانە و ناوچە باشووریەکانی تری کوردستان لە چاو شێوەی موکریانیدا، زۆرتر لە چاوگی (**دان**)ەوە سەرچاوە ئەگرێت و هەروا کە وتمان پیتی (د) ئەخورێت، وەک ئەو هێڵکاریەی سەرەوە.
ئەمە گرنگترین هەڵەی شێوەگەلی بانە ، سلێمانی،ئەردەڵان ، کەرکووک ، گەرمیان سەقز، مەریوان ، هەتا ناوچەکانی کرمانشان ، ئیلام ، لەکستان و مەندەلی و خانقین و بەدرە و عەلی شەرقی و عەلی غەربی و ئەلەشتەرە .چونکە دانیشوانی ئەم شار و ناوچە ناوبراوانە لە زۆر وشەو رستەدا پیتی دال ئە خون و یا ئەیکەن بە پیتی ( ی).

# زیادیی پیتی (د) له هەندێ وشەی موکریانیدا

بەڵام زۆر جار له موکریانیدا به هەڵە پیتی (د) ئەلکێنن به هەندێ وشەوە، و یان له ناوەندی وشەکەدا ئەیلێن، بەڵام ئەم پیته زیادیه و پێویست ناکات له خۆوه بخرێته ناو وشەکه و هەندێ له وشەکان له زمانەکانی عەرەبی و تەنانەت له قورئانەوه هاتوونەته ناو زمانی کوردی و یا لەگەڵ فارسی له یەک رەگ و ریشەن، بەڵام له موکریانیدا به هەڵە ئەوترێن، وەک هێڵکاریی خوارەوه:

## هێڵکاری:

| دروست | هەڵه (موکریانی) |
|---|---|
| تەنوور | تەندوور |
| جنۆکه | جندۆکه |
| دەنووک | دەندووک |
| جەهەننەم | جەهەندەم |
| دەمنه | مۆدنه |
| زەماوەن | زەماوەند |

لێردا پێویسته واتای چەند وشه شی و تاوتوێ بکەینەوه. دەمنەی جگەره واته شتێ که ئەنرێته ناو دەم، بەڵام مۆدنه واتای نیه. وشەی جنۆکه، وشەیێکی قورئانی‌یه و پیتی (د) ی نیه. وشەی زەماوەن له زاراوەی هەورامی‌یەوه وەرگیراوه و له دوو وشەی زەما (واته زاوا) و (وەن) واته (ئەوەن – ئەبەن) پێک هاتووەوه واته کاتێ که زاوا ئەبەن. زەماوەن = زەما ئەوەن، واته زاوا ئەبەن بۆلای بووک و ئیتر پیتی (د) زیادییه. ئەمه لەگەڵ وشەی (گۆڤەند)ی باکووریدا جیاوازه.

تەنانەت زۆرجار لە موکریانیدا پیتی (ب) ئەلکێنن بە هەندێ وشەوە و یان ئەیخەنە

ناوەراستی وشەکەوە وەک:

حومبەر(عومبەر) کە مەبەست لە (عومەر)ە

حەمباڵ(عەمباڵ) کە مەبەست لە (حەممال)ە

شایانی سەرنجە وشەی (دەنووک) لە دوو بەشی (دەم) و (نووک)ەوە پێک هاتووە

واتە دەمێک کە نووکی هەیە و ئامێر و ئەندامی چنە، خواردن، بەرگری و گۆرانیی

پەلەوەرە. بەڵام دەندووک هەڵەیە و واتای نیە و لە موکریانیدا وشەی دەمیان نیە و

بەدەم ئەڵێن زار (بێجگە لە بۆکان کە ئەڵێن (دم Dim) و لە گەورکی بۆکاندا

ئەڵێن: دەم=Dem . دیارە ئێمە تەنیا بە دەمی **مەشکە** و شتوومەکی تر ئەڵێین زار.

با ئەم راستی یەش بڵێین کە دەیان ملوێن کورد لە باکوور و رۆژئاوای کوردستان

وشەی (زار ) بە کار ئەهێنن و وشەی زاراوە لەم وشەی باکووری و موکریانی یەوە

وەرگیراوە و زاریش بۆخۆی لە کرمانجیی باکووریدا وێژەیی و دروستە.

# خوێن – خوێندن – خوێ – بەنەخوێن

لە هەندێ شاری موکریاندا وەک شاری بۆکان، خەڵک ناتوانن چوار وشەی ناوبراوی سەرەوە بەدروستی بەسەر زماندا بهێنن و لە کاتی وتنی ئەم وشانەدا، پیتی (و) لا ئەبەن و ئەیانخۆن و بەم شێوە ئەیانخوێننەوە:

خێن ، خێندن، خێ ، دۆخێن. بەڵام تەنانەت لە کوردیی باکووردا ئەڵێن خوین وەک وشەی لێکدراوی «**جگەرخوین**» واتە هۆنەر و زانای کورد.

لە ڕێکەوتەکانی (٦) و (٧)ی مانگی خرمانانی ساڵی **١٣٨٧**(هاوینی **٢٠٠٨**)ی زایینی دا تێلێویزیۆنی **سەحەر** بەرنامەی پزشکی و نەخۆشیی ژنانی بڵاو ئەکردەوە. زانایێکی نەخۆشیەکانی ژنان و پرسیارکەرێکی کاربەدەست کە هەردووکیان ئافرەت بوون، نزیکەی ٦٠ خولەک باسی نەخۆشیەکانی **منداڵدانی** ژنیان ئەکرد و لەو ماوەیەدا لانی کەم ٢٠ جار باسی خوێن کرا، بەڵام چونکە هەردووکیان شێوەی زاراوەکەیان لە چەشنی بۆکانی و موکریانی بوو، هەر ئەیانوت خێن. خۆ ئەو تێلێویزیۆنە بەرنامەکەی ویژەیی و فۆرمی یە، ئەی بۆچی ئەو دوو ئافرەتە تەنانەت جارێک وشەی فۆرمیی (خوێن)یان بەکار نە هێنا؟بۆ درۆ و راستی ئەتوانن بڕواننە فیلمی ئارشیڤەکەیان.

کاک حەسەن دەرزی لە کۆتاییی گۆرانیەکەیدا کە لە بارەی هەڵۆوە ئەیڵێ، لە باتیی ئەخوێنێ، ئەڵێ دەخێنێ. دیارە ئەویش خەڵکی شاری بۆکانی موکریانە، گەرچی شێوەی بۆکان لە چاو شێوەکانی هەندێ شار و گوندەکانی تری موکریانی ئێراندا باشتر و ویژەیی ترە. بۆ وێنە لە بۆکان ئەڵێن دم و لووت (dim û lût)

بەڵام لە مەهاباد ئەڵێن زار و کەپۆ. لە گەورکی بۆکان ئەڵێن دەم و لـووت (dem û lût).

## رەنگە – بۆی هەیە – لەوانەیە – ئەگونجێ

لە موکریانیدا لە جیاتیی زۆربەی ئەم وشانە، وشەگەلی **پێ دەچێ**، **وێ دەچێ**، **بەوی دەچێ** بەکار ئەهێنن بەڵام لێرەیشدا شێوەی موکریانی وێژەیی و ستاندارد نیە. لە شێوەی ستاندارد و وێژەییدا پێ چوون چەند واتای تری هەیە. نموونە:

١-خایاندن، وەک:

لە سەفەرەکەدا دوو رۆژم پێ چوو

٢-لاواز بوون، وەک:

رامیار بە هۆی نەخۆشی‌یەوە پێ چووە.

ئیستا ئەوەتیی هەولێرکراوە بە پێتەخت و حوکومەتەکانی باکوور وباشووری کوردستانی عێراق تێکەڵ کـــراون، ئەو ئایدیۆم و وشانەی موکـــریان زۆر جار بەکارئەهێنرێن.

لە رستەی (بەوی دەچێ)دا، چونکە موکریانی نیشانەی ئاماژە بۆ نزیکیان نیە، واتە نیشانەی (ئەمە)یان نیە، ناتوانن بڵێن لەمە ئەچێ و لە جیاتیی ئەمە، (وی) بەکار ئەهێنن و ئەڵێن بەوی دەچێ. (وی) واتە (ئەو) یا (ئەوە) و سێیە م کەسی تاقی بزرە و لە فارسی‌یەوە هاتووە. وی را بوسیدم (واتە ئەوم ماچ کرد– فارسی).

ئەو چاویلکە ئی ویە (موکریانی) واتە ئەم چاویلکە هینی ئەوە.یان: ویَ دەچی واتە لەوە ئەچیَ، بۆی هەیە. (وی)، واتە ئەو کە ئەبیّتە سیَیەم کەسی تاقی بزر.

## سەرخۆشی – چاودێری و ...

لە موکریانیدا لە جیاتیی ئایدیۆمگەلێکی لێکدراو وەک سەرخۆشی و چاودێری پیتی (ە)ی پێوە زیاد ئەکەن و لە نێوان دوو وشەکەدا ئەیڵێن و ئەینووسن و ئەمەیش بەم هۆیانەوە هەڵەیە:

١-لە کوردستانی باکووردا بە سەرخۆشی ئەڵێن سەرساغی و لە کوردستانی ئەردەڵاندا ئەڵێن سەرسڵامەتی. هیچکامیان پیتی(ە) لە نێوان دوو وشەکەیاندا نیە. دیارە ساغ و سڵامەت لە تورکی و عەرەبییەوە دزەیان کردووە.

ئێمە چەند ئایدیۆممان هەیە کە لە نێوان دوو وشەکەدا پیتی (ە)یان هەیە و یەکێکیان (**چاوەڕێ**)یە، بەڵام ئەمە لە سەرچاوە و بنەڕەتدا (چاو-وەڕێ) بووە و شێوەی زمانی ئەردەڵان و ناوچەکانی باشووری و بابان و سلێمانی و خانەقین و کەلوڕ و لەک بووە و بە گوێرەی رۆژگار بووە بە چاوەڕێ واتە چاوبەڕێ و لەبەر ئەوە کە (وتنی دووپیتی وو) لە پاڵ یەکتردا سەخت و گرانە، پیتێکیان خوراوە و نەماوە و لە بانە و سلێمانی و زۆربەی شار و گوندە کوردنشینەکان هەر چاوەڕێ ئەوترێ. یەکێکی تر لەو ئایدیۆمانە(چاوەڕوان)ە ئەویش واتە چاو ئەڕوان و ئەمە ئاوەڵناوی بکەر (صفت فاعلی)ی لێکداروە.

ئایدیۆمێکی تری لەم چەشنانە،(چاوەزار)ە و ئەمەیش لە بنەڕەت و سەرچاوەدا (**چاوئازار**) بووە و بە گوێرەی کات و رۆژگار دوو پیتی (ئا) خوراون و بوون بە (ە) و سەرئەنجام بووە بە چاوەزار واتە نزا و دۆعایێ کە مرۆڤ لە بەرانبەر چاوی چەپەڵ و ئازاری چاوی پیسدا ئەپارێزێت. کە واتە ئیتر ئایدیۆمگەلی سەرخۆشی و چاودێری و ... لە ناوە رستیاندا پیتی (ە)یان نیە و ئەم ئایدیۆمە لێکدراوانە بۆ نموونە ئەخەینە سەر لێنووس:

**سەربەرزی، سەرشۆڕی، سەروەری، سەرسووڕمان، سەربەستی، سەربەخۆیێ، چاوچنۆک، چاوچلێس، چاوفڕین، چاوبرکێنێ.**

ئایدیۆمی (سەرەڕێ) لە رستەی (من سەرەڕێکەت لێ ئەگرم وەک حەمەتالی بانە) لە بنەڕەتدا سەری رێ بووە و بە تێپەڕانی کات و رۆژگار و لە بەر ئەوە کە پیتی (ی) لە نێوان دووپیتی (ر)دا هەڵکەوتووە، گوڕاوە و بووە بە (ە). هەروا وشەیێ وەکوو **قسەڕاست**، بەرەبەرە پیتی (ق)ەکەی خواروە و بووە بە (سەرڕاست).

کە واتە بۆمان دەرکەوت کە **سەرخۆشی** دروستە و **سەرەخۆشی** هەڵەیە. ئیستا بە هۆی هەندێ رادیۆ و تێلێویزیۆن و ئامێرە پەیوەندییەگشتی‌یەکانەوە زۆر کەس بە هەڵە ئەڵێن و ئەنووسن سەرەخۆشی، بەڵام لە زمانی سکماکیی خۆیان و لە کوردیی وێژەییدا سەرخۆشی ئەوترێت و ئەنووسرێت و هەروا کە وتمان لە باکووریدا سەرساغی و لە ئەردەڵاندا سەرسڵامەتی (پرسە) ئەوترێت و هیچکامیان پیتی (ە) لە نێوان دوو وشەکەدا بەکار ناهێنن.

لە موكریانیدا هەندێ چاوگ و وشە و ناوی تر، بە هەڵە ئەنووسرێن . لە وشە و چاوگی (گەییشتن)دا، یەكێ لە پیتەكان (ی) لا ئەبەن و ئەیكەن بە گەیشت. وشەی پاییز ئەكەن بە پایز. وشەی بژیو ئەكەن بە بژێو. لە كاتێكدا كە وشەی بژیو لە وشەگەلی ژین و ژیانەوە هاتووە. لە مانگەكانی گەلاوێژ یا خرمانانی ساڵی (١٣٨٧-٢٠٠٨)دا بەڕێز هەندرێن كە لە بەرنامەی تێلێزیۆنێكی كوردیدا لە بارەی زمانی كوردییەوە قسەی ئەكرد و رەخنەی ئەخستە بەرباس، لە جیاتیی بژیو، وشەی بژێوی بەكار ئەهێنا چونكە شێوەی وتنی ناوچەی خۆیان بژێوە. تەنانەت ئەوكەسەیش كە قسەی لەگەڵدا ئەكرد، لە باتیی چاوگ گەلی سەیركردن، روانین و تماشاكردن، ئایدیۆمی **چاولێكردنی** بەكار ئەهێنا چونكە ئەویش موكریانی بوو و ئەمانە لە باری وێژیی یەوە هەڵەن. با لە چەند رستەی پیتگەلی لاتیندا هەڵەكان هەڵسەنگێنین:

| كوردیی لاتینی ستاندارد | | كوردیی لاتینی موكریانی و هەڵە | |
|---|---|---|---|
| گەییشت | geyîşt | گەیشت | geyşt |
| پاییز | payîz | پایز | payz |
| بژیو | bijîw | بژێو | bijêw |
| بهاوە (بهاویژە) | bihawe(bihawîje) | باوە | bawe |
| شیرین | şîrîn | شیرن | şîrin |

شایانی سەرنجە تەنانەت لە سلێمانی زۆرجار هەر دوو پیتی (یی) ئەخۆن و ئەڵێن و ئەنووسن تێگەشتن (لە جیاتیی تێگەییشتن).

## چاوگ یا وشەی (گوێزانەوە)

لە موکریانیدا ئەڵێن گواستنەوە و بۆ بەرکاری نادیار واتە (مفعول مجهول) ئەڵێن گواستراوە. بۆ سەلماندنی هەڵە بوونی ئەم وشە و چاوگە لە شێوەی موکریانیدا، چەند وێنەیێ لە چەند چاوگ و بەرکارە تێپەڕە نادیارەکانیان ئەهێنینەوە:

| بەرکاری نادیار | چاوگ |
|---|---|
| گوێزرانەوە | گوێزانەوە |
| هێنرانەوە | هێنانەوە |
| بێژرانەوە | بێژانەوە |
| پێچرانەوە | پێچانەوە |
| کێشرانەوە | کێشانەوە |
| لێسرانەوە | لێسانەوە |
| پێورانەوە | پێوانەوە |
| هەڵدرانەوە | هەڵدانەوە |

ئەلبەتە ئەتوانین گوێستنەوە بەکار بهێنن، بەڵام گواستنەوە ناوێژەیی یە. تا چەند ساڵ لەمەپێش خەڵکی سلێمانی وکاربەدەستەکانیان لە رادیۆ و تیلیڤیزیۆن و چاپەمەنیەکاندا، ئەیانوت و ئەیاننوسی گوێزانەوە و گوێزرانەوە و گوێستنەوە، بەڵام ئیستا لە ژێر کارتێکردنی هەولێری و موکریانیدا بە هەڵە ئەڵێن و ئەنووسن گواستنەوە!! ئایا لە زانیاری و زمانی وێژەییدا چاولێکەری و لاسایی کردنەوە بەشێوەی ناوێژەیی جێیوەرگرتنە؟ ئایا گواستنەوە و گوازرانەوە دروستن؟

لە موکریان (بۆ نموونە لە شاری بۆکان) کە وشەی (گوێز) بە (جۆز) ئەخوێننەوە و

لە شاری بۆکان تەنانەت پیتی ( ز) بە ( ض ) ی ئەخویننەوە و ئەڵێن (جۆض) .

ئەوان ناتوانن وشەی گوێزانەوەیش بە دروستی بەسەر زماندا بهێنن و بە گوێرەی تێپەڕانی رۆژگار، گواستنەوە بە کار هێنراوە. لە بەشەکانی داهاتوودا لە سەر ئەمە ئەڕۆین.

## چاوگی ویستن

لە موکریانیدا لە کاتی وتن و بەکار هێنانی چاوگی (**ویستن**)دا بەم چەشنە ئەدوێن و ئەنووسن کە نموونە (راناو) و کاری ویستن لە هێڵکاریی خوارەوەدا ئەخویننەوە ، بەڵام جێگەی پرسیارە کە ئایا چاوگ و (مصدر)ی کار و کردەوەی ناوبراو (ویستن)ە یان هەویستن؟ لە کوردیی کەلوڕیدا چاوگی (تواستن) و لە باکووریشدا چاوگی خواستن (خاستن xastin ) بە کار ئەهێنرێت. لە زمانی فارسیشدا کە لەگەڵ زمانی کوردی لە یەک ریشە و بنچینەن، چاوگی خواستَن (خاستەن) بە کار ئەهێنرێت، بەڵام نازانین لە موکریانیدا پیتی (ه) وەک وشەی (دەمهەوێ) لە کوێوە هاتووە!! ئەگەر چاوگەکە (هەویستن)ە، وەری ئەگرین بەڵام ئەگەر چاوگەکە (ویستن)ە، ئەمە وێژەیی و دروست نیە کە بڵێین و بنووسین دەیهەوێ و دەتانهەوێ و ... هتد.

بڕاوننە هێڵکاریی لاپەڕەی دوایی.

←

هەڵسەنگاندن:

| هەڵە | ویژەیی |
| --- | --- |
| دەمهەوێ | دەمەوێ |
| دەتهەوێ | دەتەوێ |
| دەیهەوێ | دەیەوێ |
| دەمانهەوێ | دەمانەوێ |
| دەتانهەوێ | دەتانەوێ |
| دەیانهەوێ | دەیانەوێ |

دیارە لە شێوەی ئەردەڵاندا چاوگی (گەرەک بوون) بە کار ئەهێنرێت، وەک:

گەرەکمە، گەرەکتە، کەرەکیە، گەرەکمانە، گەرەکتانە، گەرەکیانە.

## داگیرساندن - گیرسان

لە شێوەی موکریانیدا ئەڵێن دایسان و ئایسان. دیارە لە رۆژگاری کۆندا بۆ رووناکی، لە شەم و مۆم و مێو، یان لە پیوی ئاژڵ و پاتاڵ و لەم چەشنە شتانە کەڵک وەرگیراوە و مۆم و پیوەکەیان گیرساندووە و وتوویانە گیرساندن (لکاندن) و بەربەرە وتوویانە داگیرساندن چونکە کارەکە بەرەو خوارەوە ئەنجام دراوە. ئیستا لە ناوچەکانی سلێمانی، چوارتا، بانە، شارەزوور و ئەردەڵان و زۆر جێگە و شوێنی تردا ئەڵێن داگیرساندنی جگەرە، گیرسانی ئاگر و مۆم. بەڵام لە موکریانیدا وشە و چاوگەکەیان گۆڕیوە و پیتی (گ) و پیتی (ر) لە داگیرساندا لابراوە و ئەڵێن دایسان و بەرەبەرە پیتی (د) یان لابردووە و کردوویانە بە ئایسان.

ئەگەر بلێن دەگیرسێ یا ئەگیرسێ، ئەڵێن ئایسێ، دایسێ و ئەمانە زۆر هەڵەن.

هەڵسەنگاندن:

| کوردیی ستاندارد | هەڵە – کوردیی موکریانی |
|---|---|
| داگیرسان<br>ئەگیرسێ – دائەگیرسێت | دایسان<br>دایسێ – دەئایسێ |

ئێستا هەندێ کەس تەنانەت وشەگەلی (ئایسان) و (دایسان)یان کردووە بە ناوی تابلۆی سەر دووکانەکانیان و لە بانە چەند نموونە بینراوە.

## تر (دیکە ـ دی ) ؟

هەروا کە ئەزانین، پاشگر و وشەی (تر) واتای other و more لە زمانی ئینگلیسی و (آخر) یا (أُخری) لە زمانی عەرەبی و autre لە زمانی فەرانسەییدا ئەدات. هەروەها واتای ئامراز و نیشانەی ئاوەڵناوی بەرتر (تفضیلی) ئەدات. لە موکریانیدا لە جیاتیی (تر) وشەی دیکە بەکار ئەهێنن و (دیکە) هەر (دیگر)ی فارسی یە. کەواتە (تر) باشترە، وەک:

| ستاندارد | موکریانی |
|---|---|
| دوو رۆژی تر دێم | دوو رۆژی دیکە دێم |

زمانی کوردی هەتا وشەی کەمتری لە زمانی ترەوە وەک (فارسی) هەبێ، سەربەخۆترە. دوکتورێکی لەش کە خەڵکی موکریان نەبوو، لە ساڵی ۲۰۰۸ دا لەسەر تیلێویزیۆنێکدا قسەی ئەکرد و وشەیێکی ویژەیی کە بەلای ئەوەوە گرنگ بوو، (دیکە) بوو و زۆرجار بەکاری ئەهێنا و وای ئەزانی زمانی ویژەیی و ستانداردی

کوردی هەر دیکەیە!! بەڵام بۆی گران بوو کە بۆ نەخۆشیی تیفۆئیدی فەرانسەیی یا تایفۆئیدی ئینگلیسی، وشەی کوردیی کەوتوویی یا گرانەتا بەکار بهێنێ!! لە شارەکانی بانە، سلێمانی، سەقز، سنە، چوارتا، مەریوان، پێنجوێن، کرماشان، کامیاران، دیواندەرە، دێگولان، قوروە، هەوشارە، کەرکووک و گەرمیان، دەربەندیخان، هەڵەبجە و شارەزوور، کەلار، سەیدسادق، رەوانسەر، چەمچەماڵ، جوانرۆ و زۆرشاری تر، وشەی (تر) بەکار ئەهێنرێت. ئەم راستی یەیش بڵێین کە لە سلێمانی و چوارتاوبانەدا زۆرجار وشەی (کە) بەکار ئەهێنرێت، وەک:

دوو رۆژی کە، جارێکی کە،ساڵێکی کە. بەڵام پێشگری (دی) لە گەڵیدا بەکار ناهێنرێت و لە جیاتیی چیدی و ئیدی، ئەڵێن ئیتر. دیارە ئیدی لە چیدی (چیی دی – چی دی) باشترە و کوردی باکووریش ئەڵێن ئیدی. ئیتر و other لە زمانی ئینگلیسیدا لە یەک ریشەن:

هەروەها لەگەڵ autre (ئۆتخ) لە فەرانسەییدا هاوڕیشەن. بەڵام لە زمانی فەرانسەییدا بێجگە لە خەڵکی هەندێ شار وەک مارسەی، پیتی R بە خ یا غ ئەخوێننەوە. لێرەدا ئۆتخ ئەخوینرێتەوە. بەڵام لە وشەیێکدا وەک Pére (باوک) پیتی R بە غ ئەخوێننەوە چونکە لە دوای پیتی دەنگداری é هاتووە. لە بارەی هاوبەشی و هاوڕیشەیی بوونی هەندێ وشەی کوردی و فەڕانسەیی یەوە، لە بەشەکانی داهاتوودا باسی لێ ئەکەین.

# ناو

ه موکریانیدا له جیاتیی ناو، وشەی نێو به کار ئەهێنرێ، بەڵام تەنانەت له کوردیی
اکوور و بادینانیشدا له وشەی ناڤ کەڵک وەرئەگرن که زۆرتر له (ناو) ئەچێت و
ه کوردیی ویژەییدا زۆرتر ناو به کار ئەهێنرێت وەک:

**اوەند، ناودار، نازناو، ناوچە، چەکی ناوکی، ناونیشان، ناوک، ناوخۆ، ناوەنیتکە، هاوناو، امناوەندی . وەزیری ناوخۆ، ناوجەرگە، ناوەڕاست، بەناو (به اصطلاح)، بەناوبانگ، ۆژهەڵاتی ناوەڕاست.**

ه پەرتووکه کوردیەکاندا وەک پەرتووکی (ئەو وشانەی له چاوگەوە سەرچاوە
ەگرن) نووسراوی دوکتور رەفیق محمد شوانی، له باری رێزمانەوە له (ناو) کەڵک
ەرگیراوە وەک: ئاوەڵناو (صفت)، جێ ناو، راناو. تەنانەت له هەولێر زۆر وشەی
گرنگ به (ناو) ئەڵێن و ئەنووسن وەک: خۆشناو – خۆشناوەتی – ئیتر ناڵێن
خۆشنێو .

ه زۆربەی پەرتووکه رێزمانیەکاندا تەنانەت زانایانی هەولێر و موکریانی هەرێمی
کوردستانی باشووری، کەڵکیان له ناو وەرگرتووە.

دیارە وترانی وشەگەلێک وەک خۆشناوەتی له ناوچەی هەولێردا، نیشانەی
ەسەنایەتی و ویژەیی و مێژوویی بوونی وشەی (ناو)ە.هەر بۆیه نووسەرانێکی
ەرێز وەک سەلام ناوخۆش و نەریمان خۆشناو ناوەکەیان له وشەی( ناو)ەوە
ەرگیراوە .

# کەم و زیاد بەکار هێنرانی هەندێ پیت

هەندێ پیت و پاشگر کە لە موکریانیدا بە وشەی و ناوەوە ئەلکێن، زیادین و نموونەی ئەمانە، لەم رستانەدا دەر ئەکەون:

رامیار برینجی دەگەڵ گۆشتی دەخوات.

لێرەدا پیتی (ی) کە لکاوە بە وشەگەلی (برنج) و (گۆشت)ەوە زیادی یە و دروستەکەی ئاوایە:

رامیار برنج لە گەڵ گۆشت دەخوات.

شایانی سەرنجە کە لە ناوەڕاستی وشەی (برنج)دا دیسان پیتی ی هاتووە و ئەمەیش نادروستە. هەروەها پریپۆزیسیۆنی لەگەڵ باشتر و دروست تر لە (دەگەڵ)ە.

دەڕۆمەوە بۆ مەدرەسەی (هەڵە).

دەڕۆمەوە بۆ مەدرەسە (دروست).

پەنیریت بۆ دەهێنم (هەڵە).

پەنیرت بۆ دەهێنم (دروست).

من حەز لە گۆشتی مریشکی دەکەم (هەڵە).

من حەز لە گۆشتی مریشک دەکەم (دروست).

گۆشتی رانی دەخۆی یان سینگی؟ (هەڵە).

گۆشتی ران دەخۆی یان سنگ؟ (دروست).

لە کۆ کارێ دەکەی (هەڵە) (شێوەی بۆکان و ...)

لە کوێ کار دەکەی (دروست). دیارە پیتی ک لە چەشنی شێواو(قورس)ە و لە نێوان دوو پیتی (ک) و (چ)دا بە سەر زماندا دێت.

بەدەستێکان دوو کار ناکرێت (هەڵە)

بە دەستێک دووکار ناکرێت (درووست)

با پیاسەیێکی بکەین (هەڵە) - با پیاسەیێک بکەین (درووست)

دەچمەوە بۆ مالێ (هەڵە)

دەچمەوە بۆماڵەوە (دروست)

یان هەندێ وشەی تر کە پیتی زیادییان هەیە وەک گرینگ کە دروستەکەی بریتی‌یە لە گرنگ. گەرچی لە کرمانجیی باکووریشدا هەر ئەڵێن گرینگ.

بە پێچەوانە، لە هەندێ وشەدا، پیتێک کەم ئەوترێت وەک سرنج کە راستەکەی (سەرنج)ە.

یان شیرن و شرین کە دروستەکەیان (شیرین)ە. شایانی وردبینی‌یە کە جاری وا هەیە لە کوردستانی موکریاندا پیتێک لە جیاتیی پیتێکی تر بەکار ئەهێنرێت، وەک:

گێوژ لە موکریانی ئێراندا کە لە جیاتی گۆییژ ئەوترێت.

جاری وایش هەیە کە لە کوردستانی باشووریدا پیتێک بە زیادی ئەوترێت وەک پزیشک کە دروستەکەی (پزشک)ە.

هێڵکاری (تابلۆ)ی هەڵسەنگاندن

| هەڵە<br>بە پیتگەلی لاتین | هەڵە<br>بە پیتگەلی عەرەبی | دروست<br>بە پیتگەلی لاتین | دروست<br>بە پیتگەلی عەرەبی |
|---|---|---|---|
| Sîng | سینگ | Sing | سنگ |
| Girîng | گرینگ | Giring | گرنگ |
| Sirinc | سرنج | Serinc | سەرنج |
| şîrn-şirîn | شیرن – شرین | Şîrîn | شیرین |
| Wan | وان(موکریانی و باکووری) | Ewan | ئەوان |
| Pizîşk | پزیشک (کوردستانی باشووری) | Pizişk | پزشک |
| Gêwij | گێوژ | Goyîj | گۆییژ |
| Bellênî | بەڵێنی | Bellên | بەڵێن |

## وشە و شیکردنەوەی واتایی یەکانیان لە شێوەی موکریانیدا

## (نموونەکانی)

زۆر وشەی موکریانی و ناوچەی هەولێر هەن کە لە شێوەی وێژەیی و ستانداردا بەکەڵک نایێن و واتای زانیاری و زانستییان نیە و یان لە فارسی یەوە نزیکترن تا کوردی و ئەمەیش بەشێ لەو وشانە کە لەگەڵ وشەگەلی وێژەیی و ستانداردا هەڵیان ئەسەنگێنین:

| شێوەی ستاندارد و وێژەیی | شێوەی موکریانی |
| --- | --- |
| لافاو | سێڵاو – (سیلاب – فارسی) |
| بەرز | بڵیند (بلند – فارسی) |
| دەم | زار |
| نانەوردە | ورکەنان |
| قۆل | باسک (بازو – فارسی) |
| زیخ | خیز |
| هەنگ | مێش – مێش هەنگوین |
| دراوسێ | جیران(رەگی عەرەبی) |
| کەڵەشێر | کەڵەباب |
| باوک | باب (بابا – فارسی، اب- عەرەبی) |
| قاچ – پێ | لاق |
| چەم | چۆم (تەنانەت کەلوڕی، لەکی و بادینانی ئەڵێن چەم) |
| دەمنە | مۆدنە |
| ئەمەندە – ئەوەندە | هێندە |
| بەندەخوێن –بەنە خوێن | دۆخێن – بەنە خێن(موکریانی ئێران) |
| بەرهەم هێنان | وەبەرهێنان |
| سەلوێنک - خەوشدان | زبڵدان (زباله دان – فارسی) |
| توێشە | غوڕابی |

| | |
|---|---|
| تر | دیکە (دیگر – فارسی) |
| ئاگابوونەوە | وەخەبەر هاتن (خەبەر – عەرەبی) |
| لووت | کەپۆ (لە زۆر ناوچە بۆ ئاژەڵ و پاتاڵ ئەبێت) |
| دەم و دیان | زار و ددان (دندان – فارسی) |
| ناشیرین | ناحەز – رەگی عەرەبی |
| گوێرەکە | گوێلک - گۆلک |
| چکۆلە (پیتی (لە) ئامرازی گچکە کارە) | چووک – چووکە |
| شەق | شەپ |
| ئیتر - ئیدی | چیدی |
| دوێنێ | دۆینێ – دۆنێ – doونێ |
| سەرنج | سرنج |
| بمدەرێ | وێمدە |
| ئێوە | ئەنگۆ(باکووری) |
| تێخستن | تێهاویشتن – لێبردن – (لە ئەردەڵاندا لێخستن)ە |
| کارەکەر | قەرەواش (تورکی) |
| مێشوولە کوێرە | مۆغمۆغە |
| هێلکە | زەردە بەقوونێ – جلیقانە(لە هەندێ ناوچەی موکریاندا ) |
| سک (وشەی سکاڵا واتە شکایت لە سکەوە وەرگیراوە) | زگ |
| گسک | گەسک |
| هین | وانێک |
| قژ – موو | تووک (تورکی) |
| ناشتا | قاوەڵتوون |
| کەی؟ | چ محەل؟ (مەحەل رەگی عەرەبی) |
| دوای نیوەڕۆ | پاش نوێژان(ئاخر نوێژی نیوەڕۆ، ئێوارە، شێوان یان خەوتنان؟) |
| کتری | قەرەوانە (رەگی تورکی) |
| خەڵووز | رەژی (رەشی) |

لەو ناوانەدا کە بە ریز نووسراون، بۆمان دەر ئەکەوێت کە یان شێوەی فارسییان هەیە، وەک باسک، سێڵاو، بڵیند، زبڵدان، دیکە، ددان، یا شێوەی عەرەبی ئەدەن وەک جیران، باب (اب)، ناحەز، وەخەبەر، یا ناوێژەیی و داتاشراون وەک ورکەنان، خیز (پێچەوانەی زیخ)، کەڵەباب (کەرەباب)، وەربەرهێنان، کەپۆ، چووک، مێش (مێش هەنگوین)، غورابی و هتد....

ئیستا هەندێ لەم وشانە ئەخەینە بەر باس و توێژینەوە و رەخنە. نەتەنیا لە بانە و سلێمانی و شارەزوور و ئەردەڵان و گەرمیان، بەڵکوو تەنانەت لە پارێزگەی کرماشانیش بە کەڵەشێر هەر ئەڵێن کەڵەشیر. کەڵ نیشانەی نێرینەیی، پیاوەتی و ئازایەتی یە وەک: کەڵەشێر، کەڵەگا، کەڵەکێوی، کەڵەسەرکردە. بەڵام ئەگەر کەڵ ئەو نیشانانەی هەیە و نێرینەیی و پیاوەتی ئەنوێنێ، ئایا وشەی باب بۆچی لە گەڵ کەڵ هاتووە؟ خۆ (باب) واتای باوک و نێربوون ئەدات، ئایا دوو وشەی نێر دروستە لە پاڵ یەکتردا بن ؟ ئایا کەڵەشێر جوانترە یا کەڵەباب و کەرەباب؟ خوالێخۆشبوو مەسعوود محەمەد کە یەکێ لە زانایانی زمانی کوردی و پێم وایە وەزیری فەرهەنگ لە سەردەمی عارفدا بووە، نزیکەی ١٥ ساڵ لەمە پێش لە وتار و نووسراوەیێکی خۆیدا لە گۆڤاری سروەدا نوسیبووی کە وشەی کەرەباب لە کەهرەکەی ئاوێستاییەوە هاتووە و واتای کەرکەس (بەکوردی پەلەوەری سیسارکە کەچەڵ) ئەدات (ئەڵبەتە ئەو نەینووسیبوو سیسارکەکەچەڵ). بەڵام من لە نامەیێکدا کە بۆ لێپرسراوانی سروەم نارد روونم کردەوە کە کەڵەباب و کەرەباب پەیوەندییان بە کەهرەکە و کەرکەس و ئەم شتانەوە نیە، بەڵکوو کەڵ و باب و

کەڵ و شێر لە دوو وشەی لێکدراو پێک هاتوون و کەڵ نیشانەی پیاوەتی، ئازایەتی و نێرینەیی یە. لە کرماشان ئەڵێن کەلەشیر (keleşîr) و فارسەکان واتێ ئەگەن کە سەروگوێلاکی ئەم پەلەوەر و گیان لەبەرە لە شێر ئەچێ بۆیە ناوی کەلەشیرە. دیارە ئەم بیرورِا و بۆچوونەیش وەک بیرورِاکەی بەرِێز مەسعوود محەممەد هەڵەیە.

لە موکریانیدا بە (هەنگ) ئەڵێن مێش و جارجار ئەڵێن مێش هەنگووین. هەنگوین بەرهەرمێکە کە لە هەنگ بەدەست دێت و لە دوو وشەی (هەنگ) و (وین) پێک هاتووە واتە بەرهەمێ کە پەیوەندیی بە هەنگەوە هەیە وەک پشتوێن. ئیتر مێش وشەیێکی ناشیرین و پیس و هەڵەیە و هەنگ بە گوڵەوە ئەنیشێ بەڵام مێش بە .... وە (پیسایی) ئەنیشێ. ئەگەر دەعبای ناوبراو پێی ئەوترێ مێش، بۆچی بە بەرهەمەکەی ئەڵێن هەنگوین؟ ئەڵبەتە زۆرکەس لە موکریانیەکان ناتوانن بەجوانی و رِێکی بڵێن هەنگوین، بەڵکوو ئەڵێن هەنگوون واتە بە پیتگەلی لاتینی لە جیاتیی hengwîn، ئەڵێن hengûn. بە دەعباکە ئەوترێ مێش و جارجاریش ئەڵێن مێش هەنگوین و بە بەرهەمەکە ئەڵێن هەنگوین، واتە لە بەرهەمەکەدا وشەی هەنگ هەیە و ئەمانە لە باری رێزمانی زانستییەوە هەڵەن. شایانی باسە بە برِوای من ناوی گیان لەبەر و دەعبای (ژەنگەسوورە)یش لە سەرەتادا زل **هەنگەسوورە** بووە و بەرەبەرە بە گوێرەی تێپەرِانی رۆژگار، بووە بە ژەنگەسوورە چونکە زل هەنگەسوورە لە سەر زمان سەخت بووە. وەک وشەی دمارەکوڵ لە شێوەی ئەردەڵاندا کە بە دووپشک ئەڵێن. ئەمەیش لە سەرەتادا

دومداره‌كۆڵ بووه واته (كلكداروكۆڵ)ه چونكه ئه‌و كلكه‌ی كه چزووی ژه‌هره‌كه‌ی پێوه‌یه كۆڵ دیاره و وه‌رگه‌ڕاوه‌ته‌وه بۆ دواوه و سه‌ره‌وه.

وشه‌ی بڵیند له فارسی یه‌وه نزه‌یكه چونكه وشه‌ی به‌رز كوردی‌یه و وشه‌ی بڵێند له وشه‌ی (بلند)ی فارسی ئه‌چێت. وشه‌ی به‌رز زۆر كۆن و مێژوویی‌یه و ناوگه‌لێک وه‌ک فه‌ریبورز (واته فره به‌رز)، به‌رزه‌فڕ، به‌رزه‌مژ، باڵابه‌رز و ... له كوردیی كۆندا به‌كاربراون. ته‌نانه‌ت له زاراوه‌ی لوڕیشدا زۆرتر ئه‌ڵێن به‌رز.

لای هه‌ڵۆی به‌رزه‌فڕی به‌رزه‌مژی / چۆن بژیی مه‌رجه نه‌وه‌ک چه‌نده بژیی

وشه‌ی (ده‌م) له وشه‌ی (زار) وێژه‌یی تره چونكه ته‌نانه‌ت بۆ وشه‌ی قسه‌كه‌ر و قسه‌بێژ (سخنگووی فارسی و spokesmanی ئینگلیسی و (ناطق)ی عه‌ره‌بی، ئایدیۆمی **ده‌مڕاست** به كار ئه‌هێنرێت و له شێوه‌ی ستانداردا كه‌متر زار بره‌وی هه‌یه و ئێمه ته‌نیا بۆ ده‌می مه‌شكه كه ماسته‌كه‌ی تێ ئه‌كه‌ن و ڕۆنه‌كه‌ره و دۆكه‌ی لێ ئه‌هێننه‌ده‌ر، ئه‌ڵێین زار. زۆر په‌ند و ئایدیۆمیش له ده‌مه‌وه وه‌رگیراوه وه‌ک: **ده‌مه‌ته‌قه، ده‌مه‌وڕوو، ده‌مه‌وه‌ر، ده‌مدرێژ، ده‌مه‌زه‌رد، ده‌مده‌مێنێ، ده‌مبۆڵه، ده‌م ـ به‌هاوار، ده‌مدڕاو، ده‌مشڕ، ده‌م هه‌راش، ده‌مبه‌پێكه‌نین، ده‌مه‌لاسكێ.**

وشه‌ی (لاق) كه له سلێمانی و چوارتا و بانه‌دا هه‌م پێی ئه‌ڵێن (قاچ) هه‌م پێی ئه‌ڵێن (پێ) و ئێمه به ئێسقانی درێژی ناو ران و ئه‌وانه ئه‌ڵێین لوولاق، به‌ڵام به بڕوای من وشه‌ی (پێ) له لاق و قاچ باشتره. من پێم وایه كه وشه‌ی pied (پیێد) له زمانی فه‌ڕانسه‌ییدا هه‌ر (پێ) له كوردیدا بووه و پێموایه كه وشه‌ی قاچ له زمانی توركیه‌وه دزه‌ی كردووه‌ته ناو كوردی چونكه له توركیدا به پێ ئه‌ڵێن (قچ) و (گچ) و ئه‌گه‌ر

بڵێن راکە یا هەڵێ، ئەڵێن قاچ. دیارە مرۆڤ بە قاچ هەڵدێت. بەم هۆیانەی لاپەڕەی دوایی (پێ) لە هەردووکیان واتە لە لاق و قاچ باشتر و وێژەیی ترە و لە هەندێ ناوچە وەک سەقز، شارەزوور، ئەردەڵان، کرماشان، ئیلام، خانەقین، بەدرە، زورباتیە و ... وەک فارسی پێی ئەڵێن (پا). ئەم هەموو ئایدیۆمانە نیشانە و بەڵگەی وێژەیی بوونی (پێ) یە، وەک:

**پێ شێل، پێ هەلگرتن، پێ داگرتن، پێ پەتی، پێ خاوس، پێ بەمەینەت، پێ مەڕە، پێڵاو، پێکڵ، پێوقەدەم، پێگە، پێتەخت، سەروپێ، پێلێخستن، پێخەسوو(بەربووک) پێلێنان، پێبەند، دەست و پێسپی، پێبەڕۆزی، پێناو، پێتەک.**

ئێمە ئەتوانین لە هەردوو وشەی پێ و لاق کەڵک وەرگرین و لە بادینان و باکووری کوردستاندا زۆرتر لاق بەکار ئەهێنن.

وشەی (ددان) هەروەک وشەی دەندان لە فارسیدایە. لە سلێمانی ئەڵێن دان. گەرچی لە گەڵ زمانی فەڕانسەییدا یەک ریشەیان هەیە چونکە ئەوانیش ئەڵێن دان، بەڵام لە کوردیدا دان واتای دانەمریشک و دانەوێڵەیش ئەدات. لە بانە و زۆر شارو ناوچەی تری کوردستاندا تا باشووری ترین شاری کوردستان ئەڵێن دیان و ئەم وشە لە (ددان) و(دان) جوانتر و وێژەیی تر و کوردی ترە و باشتر ئەویە کە وشەی دیان بۆ خوێندن و نووسین بە کار بهێنن و لە رادیۆ و تێلێویزیۆنیشدا وشەی دیان بڵاو بکرێتەوە چونکە نە فارسی یە، نە فەڕانسەیی یە و نە دانەمریشکە و چەند ملوێن کوردیش قسەی پێ ئەکەن و ئەڵێن دیان.

وشەی زیخ لە موکریانیدا لەو سەرەوە ئەوترێ و ئەڵێن خیز. ئەمەیش وەک زۆر

وشه وایە کە لە ئەردەڵانیدا لەو سەرەوە ئەیڵێن یا وەری ئەگێڕن و بەوتەی عەرەبی مەقلووب ئەکرێن. بۆ وێنە لە سنە و ئەردەڵاندا بە کەروێشک ئەڵێن کەورێشک ، هەروا کە لە بانە و سلێمانی زۆر جار بە تینوو ئەڵێن توونی. **تینوو** لە وشەی (تین)ەوە هاتووە. لە کاتی تین و گەرمادا مرۆڤ زۆرتر لە هەموو کاتێ **تینووی** ئاو ئەبێت و لە ئەردەڵانیشدا هەر ئەڵێن (تینگ). بڕاونە لاپەڕەی **٨٧**.

وشە و ناوی کەروێشک لە بنەڕەت و سەرەتادا کەرگوێچک بووە چونکە گوێچکە و سەروگوێلاکی لە کەر ئەچێ. تەنانەت لە بادینانیشدا مەقلووبی ئەکەن و ئەڵێن کێڤریشک kêvrîşk و تا رادەیێ وەک سنەیی دێتە سەر زمانیان. هەروا سنەیی بە دەروێش ئەڵێن دەورێش. لە بەشەکانی داهاتوودا باسی ئەم چەشنە ئاڵووگۆڕ و گۆڕانکاریانە ئەکەین.

موکریانی بە وشەی (**لافاو**) ئەڵێن سێڵاو و ئەمەیش فارسی‌یە چونکە فارسەکانیش ئەڵێن سیلاب.

وشەی (**چووک**) لە شێوەی ستاندارد و وێژەییدا، بە زەکەری پیاو واتە بە ئەندامی سێکسی و میزکردنی پیاو ئەوترێ، هەروا کە بە (بیضە)ی عەرەبی ئەڵێن (**باتوو**). بەڵام لە موکریانیدا چووک واتای چکۆلە و پێچەوانەی گەورەی هەیە.وشەی (چکۆلە) خاوەنی پاشگری (لە)یە کە پێی ئەوترێت ئامرازی گچکەکار یا بە عەربی (ادات التصغیر). لە شاری بۆکان ئەڵێن چکۆڵە (بە لامی قەڵەو).

وشەی (توێشە) کە لە فارسیدا (تووشە)یان لە مەوە وەرگرتووە، واتای شیرینی و خواردەمەنییێک ئەدات کە توێژتوێژ بووە. ئایدیۆمی چاوگی (**بەرهەمهێنان**) زۆر

ویژەیی‌ترە لە (وەبەرهێنان). وشەی بەرهەم بۆخۆی واتای محصول و انتاج لە زمانی عەرەبــی و Product لە زمـانی ئینگلیسـیدا ئەدات. بەرهەم هێنــــان ئەبێتە To produce و production و بەرهەم ئەبێتە product. وشەی بەرهەم وەک ئەمانە: بەرهەمی نیشتمان، بەرهەمی نەوت ، بەرهەمی کشت وکاڵ، بەرهەمی ئاژەڵ. هەروەها بەرهەم ناوی کوڕ و پیاوە، بەڵام (وەبەر) واتای نیە.

هەڵسەنگاندن:

بەرهەم هێنان – ستاندارد و ویژەیی

وەبەر هێنان – ناویژەیی

ئەڵبەتە دیارە لە کوردیی باکووریدا وەبەرهێنان بەکار ئەهێنرێت.

وەبەرهێنان واتای بەرهێنانەوە ئەدات وەک: وەخەبەر هاتن واتە خەبەر هاتنەوە، وەرێخستن واتە رێخستنەوە، وە خۆ هاتن کە ئەبێتە بە خۆدا هاتنەوە.

وشە و ئایدیۆمێک وەک (لەبەرچاو) باشترە لە وشەی (لە پێش چاو). تەنانەت هۆنەرەکان ئایدیۆمی لێکدراوی (لە بەرچاو)یان بە کار هێناوە وەک:

هەژار سووکە لە بەر چاوان / ناخرێتە ناو ریزی پیاوان

کە دەرکەوت ئەو دەم و لێو و ددانە / لە بەر چاوم هەموو لەعل و گوهەر کەوت

لە فارسیدا زۆرجار ئەڵێن (پیش چشم) واتە پێش چاو. کەواتە، لەبەرچــاو ویژەیی‌ترە، هەروا کە ئایدیۆمی بەرچاو زۆرجار بەکار ئەهێنرێت. نموونە:

جۆرێک هاتەبەرچاوم. وەک سەگ لەبەرچاوم کەوتووە. لاچۆ لە بەر چاوم! تارمایی بە بەر چاوما هات.

بەشی چوارەم

## فۆنێتیک و دەنگناسی لە شێوەی موکریانی و سۆران(هەولێر)دا

لە زۆر بەشی شار و گوندەکانی ناوچەگەلی موکریان، سۆران و هەولێر بە تایبەت لە هەندێ ناوچەی موکریانی ئێراندا لە کاتی قسەکردنی خەڵکدا، بەجوانی هەست ئەکەین کە زۆرجار لە جیاتیی پیتیک، چەند پیت ئەخوێنرێتەوە و تەنانەت هەندێ پیت لە زمانی خەڵکی ئەوێدا نیە و لە جیاتیی پیتگەلی (ڵ – ل) پیتی (ر) ئەوترێت و ئەمەیش لە باری دەنگناسی و فۆنێتیکی زمانەوە هەڵەیە، وەک ئەم تابلۆیە:

| ویژەیی و ستاندارد | هەولێر و دەوروبەری |
|---|---|
| چۆڵ | چۆر |
| خۆڵ | خۆر |
| پووڵ | پوور |
| داڵ | دار |
| کڵ(کۆلەکەی پرد) | کر |
| گڵ | گر |
| دڵ | در |
| دووکەڵ | دووکەر |
| کاڵ | کار |
| باڵ | بار |
| دۆڵ | دۆر |
| قووڵ | قوور |
| تۆلە | تورە |
| دێڵ | دێر |
| گۆڵ | گۆر |
| ماڵ | مار |
| داوەڵ | داوەر |

| ویژەیی و ستاندارد | هەولێر و دەوروبەری |
|---|---|
| شل | شر |
| شل و مل | شر و مر |
| کول – کوڵ | کور |
| گۆل | گۆر |
| بلبل | بربر |
| چۆلەکە | چۆرەکە |
| سەلماندن | سەرماندن |
| پەلەوەر | پەرەوە |
| کلۆر | کرۆر |
| (کلۆڵ) | // |
| مەلا | مەرا |
| فەلا | فەرا |
| مەلمەل | مەرمەر |
| کاول | کاور |
| کولانە | کورانە |
| کوولەکە | کوورەکە |
| جوولەکە | جوورەکە |

بۆ وێنە بە خۆڵ (خاک) ئەڵێن خۆر و بە خۆر (هەتاو)یش هەر ئەڵێن خۆر. دوو وشەی جیاوازی گۆڵ (سەگی نێر) و گۆل (گۆم و دەریاچە) وەک یەک بەسەر زماندا ئەهێنرێن و پێیان ئەڵێن گۆر و ئەم وشە واتای نیە.

لە موکریانی ئێرانیشدا لە هەندێ شار و گوندەکاندا زۆرجار لە جیاتیی پیتی لامی قەڵەو (ڵ) پیتی لامی لەڕ (ل) ئەخوێننەوە و لە ئاکامدا بە پێی زانیاریی فۆنێتیک و دەنگناسی، واتای وشەکان ئەگۆڕێت و واتای تریان لێ ئەبێتەوە.

هەڵسەنگاندن:

| کوردیی ستاندارد و وێژەیی | کوردیی موکریان و هەولێر |
|---|---|
| چۆڵ و هۆڵ | چۆل و هۆل (موکریان)<br>چۆر و هۆر (هەولێر) |

لە کوردیی بانە، سلێمانی، شارەزوور، چوارتا، سەقز، بۆکان، ئەردەڵان، پێنجوێن، مەریوان و گەرمیان و زۆر شار و ناوچەی تردا وشەی (چۆل) بۆ چۆلەکە دەرکردن بە کار ئەهێنرێت و وشەی (هۆل) بۆ گوێرەکە دەرکردن، واتە ئەگەر چۆلەکە لە بێستانێک دەر بکەن ئەڵێن چۆل! و ئەگەر گوێرەکە دەربکەن ئەڵێن هۆل.

لە زۆر ناوچە و شار و گوندی موکریاندا لە کاتی قسەکردندا، لە جیاتیی پیتی چ، سێ پیتی (چ – ت – س) بە تێکەڵاوی ئەخوێننەوە وەک وشەگەلی چاو، بەچکە، چەوسانەوە، پووچەڵ، چۆپی.

هەروەها لە کاتی وتنی وشەگەلێک کە پیتی (ج) یان تێدایە، لە جیاتیی (ج) سێ پیتی (د-ج-ز) بەیەکەوە و بەجارێک و بە تێکەڵاوی ئەخوێننەوە وەک وشەگەلی جووجەڵە، ئەنجومەن، جوولەکە. بە هۆی نەبوونی ئامێر و شتومەکی هونەریەوە،

لێرەدا ناتوانین بە وێنە چەشن و شێوەی بەسەر زماندا هێنانی پیتەکان پیشان بدەین.

ئەڵبەتە جاری وا هەیە کە لە جیاتیی پیتی چ، دوو پیتی (چ —س) ئەخوێننەوە و لە جیاتیی پیتی ج، دوو پیتی (ج-ز) ئەخوێننەوە و پیتی (د) ناخوێننەوە و دەنگەکان لە شار و گوندەکان جیاوازییان هەیە و بۆ نموونە خەڵکی گوندەکانی گەورکی بۆکان لە چاو خەڵکی شاری بۆکان و مەهاباد و مەنگوڕەکاندا زۆر بە دەگمەن ئەو پیتانە بە سێ دەنگ و دوو دەنگ بە زمان و دەم و زاردا ئەهێنن واتە کوردەکانی باخی شێخان، قولقولە، کوێرەکانی، ئیسکی بەغدا، قازانتە، گلۆڵان و تەنانەت کوردەکانی گەورکی مەهاباد وەک قالوێ ، سڵامەت و خوڕخوڕە و براییم خەسار لە باری فۆنێتیک و دەنگناسی یەوە باشتر لە خەڵکی دەڤەری مەهاباد و مەنگوڕەکان و ناوشاری بۆکان ئەدوێن و هەروەها شێوەی دەنگناسیی هەندێ ناوچەی موکریانی عێراق ( وەک قەڵادزێ ) باشتر لە موکریانی ئێرانە و هەرکەسێ گوێی لە قسە و دەنگی خەڵکی ئەو ناوچەیانە بێ، بە جوانی هەست ئەکات کە بەتایبەت چەشنی دەنگی خەڵکی مەنگوڕ و ناوشاری بۆکان لە گەڵ دەنگی خەڵکی سلێمانی، بانە، سنە، کەرکووک و تەنانەت لە گەڵ دەنگ و فۆنێتیکی کوردیی باکووردا جیاوازە.

دیارە دەسەڵاتی تورکەکان لە مەهابادلە سەردەمی سەفەوی،مۆغۆل و قزلباشەکاندا کاریگەریی هەبووە. لە موکریاندا بەتایبەت لە موکریانی ئێراندا لە بریی پیتی (ز)، زۆرتر پیتی (ض) ی عەرەبی ئەخوێننەوە.

←

هەڵسەنگاندن:

| بانە – سلێمانی – سنە – شارەزوور و کوردستانی باکووری | موکریان |
|---|---|
| بەزاندن | بەضاندن |
| بەزەیی | بەضەیی |
| خزم | خضرم |
| رەز | رەض |
| مەزن | مەضن |
| بزن | بضن |

بۆ پیتی (س)، پیتی (ص) ئەخوێننەوە، وەک:

| وێژەیی و ستاندارد | موکریانی |
|---|---|
| کوێستان | کویصتان |
| ئیستا | ئیصتا |
| بەستن | بەصتن |
| دەست | دەصت |
| مەبەست | مەبەصت |

دیارە ئەتوانین بڵێین رەنگە یەکێ لە هۆکارەکانی ئەم جیاوازییەی پیتە کوردیەکان و دەنگەکانیان، ئەوەیە کە زمانگەلی تورکی و عەرەبی کاری کردووەتە سەر زمانەکەمان و شوێنەواریان لە زمانماندا بەجێماوە. بۆ نموونە، لە ناوچەی موکریانی

ئێراندا دەسەڵاتی تورکەکانی سەفەوی و قاجاڕ و لە سەردەمی بۆداق سوڵتانی مەهاباد و مۆغۆل و قزڵباشەکانەوە بگرە هەتا سەردەمی تورکەکانی عوسمانی لە کوردستانی عێراق لە هەولێر و لە هەردوو کوردستانی موکریانی ئێراق و ئێراندا و کارتێکرانی زمانی کوردی بە هۆی عەرەبی یەوە، هۆکاری ئەم گۆڕانکاری یە لە دەنگ و فۆنێتیکی زمانی کوردیدا بووون و یەکێ لە بەڵگەکان بۆ سەلماندنی ئەم راستیە، ئەوەیە کە ژمارەیێکی هەرە زۆری گوندەکانی ناوچەی موکریان تورکین تەنانەت ناوی سابڵاغ (مەهاباد) لە دوو وشەی تورکی بە واتای (کانی سارد) پێک هاتووە. بەڕێزان نەریمان خۆشناو و سەلام ناوخۆش لە لاپەڕەی ۱۸ی پەرتووکی زمانەوانیدا دیانیان بەمەدا ناوە کە پیتی (س) لە پارێزگەی هەولێردا بە (ص) ئەخوێنرێتەوە و وتوویانە کە زمانی عەرەبی کاری کردووەتە سەر زمانەکەمان. پێم وایە ئەو دوو نووسەرە بەڕێزە خەڵکی ناوچەی هەولێرن.

## خوێنرانەوەی پیتگەلی ( ع ) و (ح) لە جیاتیی یەکتر

لە موکریانیدا لە زۆر جێگا و ناوچە وەک سەردەشت، لە جیاتیی پیتی (ع)، پیتی (ح) ئەخوێننەوە و بە پێچەوانە لە بریی پیتی ح ، پیتی ع ئەخوێننەوە و بۆ نموونە، بەم چەشن و شێوە لە شار و گوندەکانی سەردەشتی ئێراندا بە سەر زماندا ئەهێنرێن.

بڕوانە هێڵکاریی لاپەڕەی دوایی.

←

| ستاندارد و دروست (پیتی ح) | هـەڵـە |
|---|---|
| حەسەن | عەسەن |
| حەمید | عەمید |
| حیزب | عیزب |
| محەممەد | معەممەد |
| رەحمان | رەعمان |

| ستاندارد و دروست (پیتی ع) | هـەڵـە |
|---|---|
| عەلی | حەلی |
| عەبدوڵلا | حەبدوڵلا |
| دۆعا | دۆحا |
| مەعلووم | مەحلووم |
| تەعەددا | تەحەددا |
| عەداڵەت | حەداڵەت |

ئەم راستی یەیش ئەبێ بڵێین کە لە شێوەی بانەییشدا چەند وشەی عەرەبی هەن کە پیتی (ع)یان تیادایە و بە پیتی (ح) ئەیانخوێننەوە وەک مەعصووم کە پێی ئەڵێن مەحسووم و تەنانەت هەندێ جار ئەیگۆڕن بە (مەحسە). هەروەها عیسمەت (عصمت) ئەکرێت بە (حیسمەت). شایانی سەرەنجە کە بەرێز دوکتور رەفیق سابیر لە پەرتووکی نووسراوی خۆیدا بە ناوی (بە ستانداردکردنی زمانی کوردی و

ئەلفوبێی کوردی) لە لاپەڕەکانی ٥٧، ٨٨ و ١١٤دا لەبریی وشەی تەعەدا، نوسیویە تەحەدا و بەم بەڵگەیە دیانی ناوە بە موددەعا و بیروڕای مندا.

پێموایە ئەو بەڕێزەیش خەڵکی موکریان (ناوچەی قەڵادزێ)یە بۆیە پیتی (ع)ی گۆڕیوە بۆ پیتی (ح) و قەڵادزێ لە عێراق، هاوسنووری ناوچەی سەردەشتە.

جاری وا هەیە لە موکریانیدا پیتی (هـ) ئەکەن بە پیتی (ح) وەک جاهێڵ واتە نەزان کە ئەیکەن بە جەحێڵ. دیارە مرۆڤی گەنج و لاو و جەوان نەزانکاری و هەڵەی زۆر ئەکات بۆیە پێیان وتووە جاهێڵ (جاهل) کە عەرەبی‌یە.

لە موکریانیدا زۆر جار ئەگەر دوو پیتی (گ) و (ی) لە یەک وشەدا بەیەکەوە بوترێن، پیتی (گ) لە گەڵ پیتی (ج)دا تێکەڵ ئەبێت وەک گیرفان، گێرە، گێڕانەوە، گێل، گوێچکە. واتە لە کاتی وتنی ئەم چەشنە وشانەدا، پیتی (گ) لە جیاتیی ئەوە کە لە لای مەڵاشوو و قوڕگدا بوترێ، لە پشت دیانەکانی پێشوودا ئەوترێت و سەری زمان و دیانەکانی پێشووی سەرەوە و خوارەوە لە یەکتر نزیک ئەبنەوە و دوو وشەی (نارنجی و نارنگی) دەنگەکانیان تا رادەیێ لە یەکتر ئەچێت و لە نێوان (ج وگ) دا ئەوترێن و زۆرجار وشەی (گ) وەک (ج) بەسەر زمان و دەمدا دێت.

هەروەها ئەگەر پیتی (ک) لەگەڵ پیتی (ی) یا (ێ)دا بەدوای یەکتردا بێن، پیتی (ک) ئەبێتە دوو دانە واتە (ک)و(چ) وەک:کیتەلە، کێڵان، مەکینە، راکێشان، کێشە.

بۆ دوو پیتی (گ) و (ک) کە بەدوای پیتگەلی (ی) یا (ێ)دا دێن، سێ وشەی گیرفان، گێرە و کێشە، دەنگی تێکەڵاوی دوو پیتی (ج) و (چ) لە گەڵ (ی) یا (ێ)دا

بە گوێی مرۆڤ ئەگەیێنن و جیاوازی یەکە دەر ئەخەن. پیتی (گ) زۆرتر دەنگی (ج) ئەدات و پیتی (ک) تارادەیێک دەنگی (چ) ئەدات. دیارە لێرەدا لە بەر کەم و کووڕی و نەبوونی ئامێرو کەرەسەی هونەری و تێکنیکی، ناتوانین جیاوازیەکە پیشان بدەین و دەریخەین، بەڵام ئەگەر بچین گوێ لە هەندێ لە قسە و وتوو وێژەکانی خەڵکی ئەو ناوچەیە بگرین، بە جوانی هەستی پێ ئەکەین. دیارە لەو کەسانەوە کە دانیشتووی ناوەندی پارێزگەی ئازەربایجانی رۆژئاوای ئێرانن بە تایبەت لە شاری بۆکان و هەرێمەکانی مەهابادا و هەولێر، هەڵەی فۆنێتیکی زۆرتر هەست ئەکرێت و ئەبیسرێت.

هەروەها لە زۆر بەشی موکریاندا، لە جیاتیی وشەی گوێ ئەڵێن گۆ، واتە پیتی (ی) لائەبەن و نایخوێننەوە و هەنـدێ لە خەڵکی رەسەنی سلێمانیش زۆرجـــار لەباتیـــی گوێگر ئەڵێن گۆگـــر و بە (لەکوێ) ئەڵێـــن (لەکۆ) و بەهـــەڵە ئەیانخوێننەوە. دیارە خەڵکی سلێمانی ئیستا لەگەڵ چەند جۆر کورد کە خاوەن شێوەگەلی جۆربەجۆرن، تێکەڵاون، بەڵام ژمارەیێ لە خەڵکی ئەم شارە، لە پشدەری دەوروبەری قەڵادزێوە هاتووون و لە کۆنەوە لەوێ نیشتەجێ بووون. دیارە پشدەریەکانیش لە ناوچەی قەڵادزێ شێوەی زمانەکەیان ئەچێتەوە سەر شێوەی موکریانی و ئیستا شاری سلێمانی تەنانەت هەندێ لە خەڵکی کۆیسنجاق و گوند و لادێکانی گەڵاڵەی شینکایەتی، مەعلوومە، ماوەت و .... ی لە ناو خۆیدا تواندووەتەوە کە شێوەی زمانەکەیان لە موکریانیەوە نزیکتر بووە و کۆی سنجاق بەرەبەرە ئەچێتەوە سەرشێوەی هەولێر و ناوچەی سۆران و تەنانەت لەوێ

بەدەگمەن پیتێ (ل) بە سەرزماندا ئەهێنن و بەگشتی کۆچی دەیان هەزارکەس لە خەڵکی گوند و شارەکانی دەوروبەر بۆشاری سلێمانی وەک گەڵاڵە، پشدەر، شارەزوور، گەرمیان، سیوەیل، شلێر، دیالە و ... هتد، لە سەر زمانی رەسەنی سلێمانی کاریگەر بووەە.

هەروەها لە موکریانی ئێراندا (وەک مەهاباد) ئەگەر دوو پیتی (و- ێ) کە بە دوای (گ – ک)دا بێن، پیتی (ێ) لائەبەن و پیتێ (و) ئەکەن بە (ۆ)، بۆ نموونە بە گوێز ئەڵێن گۆز، بە کوێر ئەڵێن کۆر و لە بۆکان بە گۆییژ ئەڵێن گێوژ و ئەم شێوە وتنانە زۆر هەڵەن و جاری وا هەیە پیتی (گ) ئەکەن بە (ج) و ئەڵێن جۆز کە ئەمە شێوەی دەنگی عەرەبی یە چونکە عەرەبەکان لە پیتی (گ) بێ بەشن و بە گوێز ئەڵێن جَوز.

---

بێجگە لەو سێ چەمک و بابەتانە و Intonation (زرِ و بۆرِ وتنی پیت و وشەکان) و Pronunciation (چەشنی بەسەرزماندا هێنانی پیت و وشەکان) کە لە سەریان رۆیشتین، شێوەگەلی موکریانی و سۆران لە چەند باری تریشەوە هەڵەیان تێدا هەیە کە بۆ نموونە بریتین لە ئەکسێنت(accent واتە کەرت و برِگە) و سترێس(stress واتە پاڵەپەستۆ یان گوشار) کە لە کاتی بە سەر دەم و زماندا هێنانی هەندێ وشەدا ، گوشار و پاڵەپەستۆ و کەرت و کێشی وشە و هەوا و ئاهەنگی رستەکان لە برِگە و جێگای خۆیاندا نابیسرێن. بۆ نموونە ئەگەر هەندێ

له خەڵکی ئەو دەڤەرانە بڵێن:(گەنم)، پاڵەپەستۆ ئەخەنە سەر بڕگەی یەکەمی وشەکە، واتە (گە).

لێرەدا لە بەر چەند هۆکار، لە سەر ئەم چەمک و تەوەرە ناڕۆین. یەکەم لە بەر ئەوە کە باسەکە پێویستیی بە ئامێری هۆنەری (دەنگ و وێنە) هەیە و ئێمەیش لە شتوومەکی هونەری بۆ پیشاندانی بزاو و بزوتنی ئەندامەکانی دووان و ئاخافتن لە کاتی وتنی وشە و دەنگەکاندا بێبەشین. دووەم لە بەر ئەوە کە رەنگە زۆر کەس نەتوانن لە بابەتەکە بگەن و وەری نەگرن.

## هەڵە جۆر بەجۆرەکان لە کوردستان بەتێکڕا

## ناوی بەرکار و پاشگری (راو) یا (ڕاو)

ژمارەیێکی زۆر لە نووسەران، وەرگێڕان و هۆنەرانی زمانی کوردی چ لە کوردستانی باشووریدا، چ لە کوردستانی رۆژهەڵاتدا لە ئێران، لە زۆر بووارەوە لە کاتی نووسینی هەندێ وشە و ئایدیۆم و رستە و کار و مۆرفیمی زمانیدا تووشی هەڵەی جۆراو جۆر ئەبن. یەکێ لەو هەڵە گەورانە، چەشن وشێوەی بەکارهێنرانی کاری تێپەڕ (متعدی) یا بە زمانی ئینگلیسی Transitive و نادیار (مجهول – passive voice) لە رستەدایە. بۆ دروست کردنی ناوی بەرکاری نادیار لە کاتی رابووردوودا، لەو چاوگانەدا کە نیشانەی چاوگەکان بریتین لە (د،ن)، (ت،ن)، (ا،ندن) وەکوو: بردن، بیستن و بەزاندن ...هتد، ئەبێ پاشگری (راو) بلکێنن بە رەگی چاوگەوە کە بەرکارەکانیان ئەبنە براو(برراو)، بیسراو و بەزێنراو.

با بڕوانینە ئەم چەند چاوگە لە کاری تێپەڕ، وەک:

بینین، دزین، نووسین، ناسین، فرۆشتن، هێنان. ئەگەر ئامراز و نیشانەکانی چاوگ لەم وشانەدا لاببەین، ئەبنە (بین، دز، نووس، ناس، فرۆش، هێن) و لە باری رێزمانەوە پێیان ئەڵێن رەگی چاوگ. ئەگەر پاشگری (راو) بەم رەگی چاوگانەوە بلکێنین، ئەبنە ناوی بەرکار و لە چەشنی کاری نادیار (مجهول)ن، وەک: بینراو، دزراو، نووسراو، ناسراو، فرۆشراو، هێنراو.

لە هەندێ چاوگ(مصدر)دا دوایین پیتی رەگی چاوگ بریتی‌یە لە (ڕ) وەک گۆڕین،

بڕین، دڕین، کڕین. لە هەندێکی تر لە چاوگەکاندا دوایین پیتی رەگی چاوگ بریتی‌یە لە (ر) وەک: بردن، کردن، خواردن، شۆردن، ناردن، سەپاندن.

ئەگەر ناوی بەرکاری چاوگەکانی ریزی یەکەم بنووسین، ئەبنە گۆڕراو، بڕراو، دڕراو، کڕراو. ناوی بەر کاری چاوگەکانی ریزی دووەمیش ئەبنە برراو، کرراو، خورراو، شۆرراو، نێرراو، سەپێنراو. لەبەر ئەوە کە خوێندنەوە و بەسەر زماندا هێنانی دوو پیتی (ڕر) یا (رر) سەخت و گرانە، هەردووکیان تێکەڵ (ئیدغام) ئەبن و ئەبنە یەک پیت واتە (ڕ) یا (ر). بەداخەوە زۆرکەس لەخۆوە پیتی (د) لە دوای پیتی (ڕ) یا (ر) ئەنووسن و ئەیخوێننەوە و ئەیانکەن بە گۆڕدراو، بردراو، کڕدراو، خوردراو، شۆردراو ... هتد. ئایا ئەم پیتی (د)ە لە کوێوە هاتووە؟ ئەگەر وابێ، ئەبێ بۆ هەموو ناوی بەرکارێکی نادیاری رابووردوو پیتی (د) بلکێنین بە پیتی دواییینی رەگی چاوگەوە. ئەگەر گوڕدراو، بیندراو، داندراو، هێندراو دروستن، کەواتە ئەبێ بڵێین و بنووسین نێژدراو، زاندراو، نووسدراو، دزدراو. شایانی سەرنجە کە زۆرکەس بە هەڵە ئەڵێن و ئەنووسن ناژدراو، ناشتراو، راگەیاندراو، سەپاندراو ... هتد. بەڵام ئەو چاوگانە کە پیتی (ا) یان تێدایە، کاتێ ئەکرێن بە کارای نادیار، پیتەکە( ا) ئەکرێت بە (ێ)، وەک: ناشتن (نێژراو) راگەیاندن (راگەیێنراو)، سووتاندن (سووتێنراو)، برژاندن (برژێنراو) وەشاندن (وەشێنراو)، بەزاندن (بەزێنراو)، خەساندن (خەسێنراو) ترووکاندن (ترووکێنراو). هەروەها پیتی دواییینی رەگی چاوگ ئەگەر (ش) بێت، زۆرجار ئەکرێت بە (ژ) وەک: کوشتن (کوژراو) رشتن (رژراو) هاویشتن (هاویژراو) شایانی سەرەنجە وشەی رژاو لە چاوگی

تێنەپەڕی (ڕژان)ەوە هاتووە، وەک برژاو، پژاو، کوژاوە، سووتاو، خنکاو کە لە (برژان، پژان، کوژانەوە، سووتان و خنکان)ەوە هاتوون. بە داخەوە بە تایەبەت لە شێوەی موکریانیدا (د) کە نازانم لە کوێوە هاتووە، ئەلکێنن بە پیتی (ر) وە و ئەم فەرهەنگە نادروستە پەرەی سەندووە و زۆربەی ئامێر و ناوەندەکانی رادیۆ، تێلێویزیۆن، پەرتووک و ... هتدی گرتووەتەوە و ئەڵێن خوردراو، بیندراو، وەرگێڕدراو، هێندراو. هەروا کە وتم، ئەگەر رەگی چاوگ دوایین پیتەکەی (ر) یا (ڕ) بێ، لەگەڵ پیتی (ر)ی (راو) تێکەڵ ئەکرێن و ئیتر ناڵێین خورراو، وەرگێڕراو، کرراو، بەڵکوو ئەڵێین خوراو، وەرگێڕاو (ترجمە)، کڕاو، بڕاو.

بەڕێز نەریمان خۆشناو لە پەرتووکی زمانەوانیدا بۆ نادیاری رابووردووی ئیستا و داهاتوو نووسیویە دەخواسترێ، کەوێندراو، هاویشتراو، بیستراو، بگۆڕدرێت، ناگۆڕدرێت، لابردرێت و هەروەها بەڕێز سەلام خۆشناویش لە پەرتووکی ناوبراودا ئەم چەشنە هەڵانەی هەبووە. ئەوان کە رەخنەیان لە کەسانێک وەک بەڕێز مامۆستا تۆفیق وەهبی بەگ گرتووە، بۆ خۆیشیان جێگەی رەخنەن. ئایا ئەوکەسانە ئەم پیتی (د) ەیان لە کوێوە هێناوە؟

بەڕێز دوکتور رەفیق سابیر لە پەرتووکی (بە ستانداردکردنی زمانی کوردی و ئەلفوبێی کوردی)دا لە لاپەڕەی (١٠٩)دا نووسیویە گونجێندراو، دانەندراو، شێوێندراو.

لە لاپەڕەی ١١٥دا وشەی گۆڕدراو، لە لاپەڕەی ١٠٦ دا وشەی دابڕدرێن نووسراوە. لە لاپەڕەی ١٠٣دا نووسیویە بخوێندرێت - خوێندکار. لە لاپەڕەی ١٠٥دا نووسیویە ئەتواندرێت. لە لاپەڕەی ١٠٦دا نووسیویە داندراو، دابڕدرێن.

من لێم روون نیه ئەو بەڕێزە خەڵکی موکریانی عێراق بێت، بەڵام چونکە لە لاپەڕەکانی ٥٧، ٨٨ و ١١٤ دا نووسیویە تەحەدا (لە جیاتیی تەعەدا) ئەتوانم بڵێم ئەویش شێوەی موکریانیی هەیە و ئەڵبەتە بیستوومە کە خەڵکی قەڵادزێیە. ئەوپسپۆڕە بەڕێزە کە لە ڕێگای بە ستانداردکردنی زمانی کوردیدا هەنگاوی هەڵ هێناوەتەوە ئایا چۆن ئەبێ بۆخۆیشی ئەم چەشنە هەڵە و نادروستیانەی هەبێ و لە زۆر دێڕ و لاپەڕەکانی تری ئەم پەرتووکەی ئەودا هەڵەی تریش ئەبینرێن کە لێرەدا جێگەی باسکردنیان نیە.

تەنانەت لە شەوی ٢٩ لەسەر ٣٠ی ئۆکتۆبری سالی ٢٠٠٨ دا بەڕێز دوکتور فواد مەعسووم لە وتوووێژێکدا لە کاناڵی تێلێویزیۆنی کوردساتدا وشەی (بیندراوی) بەکار ئەهێنا (لە جیاتیی بینراو). ئەو بەڕێزەیش لە شێوەی زمانەکەیەوە دەر ئەکەوێت کە خەڵکی پارێزگەی هەولێر یا نزیکی ناوچەی موکریانی عیراق بێت.

بەڕێز دوکتور ڕەفیق محەممەد شوانی لە پەرتووکی (ئەو وشانەی لە چاوگەوە وەردەگیرێن)دا وشە و ناوی بەرکاری وەک بڕراو، کڕراو، سڕراو، جڕراو، دڕراو ... هتد هێناوەتەوە و لە لاپەڕەی (١١٣) دا ئەم ڕاستیی‌یەی گونجاندووەوە و ئەمە نیشانەییێکە بۆ سەلماندنی بیروڕای من کە دوو پیتی (ڕر) تێکەڵ ئەبن (کۆئەبنەوە) و ئیتر هێنانی پیتی (د) و نووسینی بیندراو، کڕدراو، گۆڕدراو ... هتد هەڵەیە و زۆرتر لە دوو پارێزگەی ئازەربایجانی رۆژئاوای ئێران، باکووری رۆژئاوای سلێمانی(قەڵادزێ ، رانیە ، ڕە واندوز و هەولێر)دا پیتی (د)ی پێوە زیاد ئەکەن.

سەبارەت بە پاشگری (راو)ی بەرکار، لەگەڵ لەبەرچاوگرتنی رەخنەکانی بەڕێز دوکتۆر رەفیق محەممەد شوانی لە پەرتووکی (ئەو وشانەی لە چاوگەوە وەردەگیرێن) کە لە بارەی یەکەمین پەرتووکی رێزمانی کوردی (مختصر صرف و نحو کوردی)ی ماموستا سەعید سدقی(صدقی)یەوە نووسیویە، سەرەڕای هەندێ راستەقینە، پێویستە لە بارەی دروست کردنی بەرکارەوە کە لە بەشی یەکەمدا نووسیوە ئەم روون کاریە بکەین کە لە بەشی نەنۆری بانە و سەرشیوی سەقز و بانەو مەریوان دا، خەڵک لە جیاتیی پیتی (ر) لە پاشگری (راو) لە بەرکاردا، پیتی (ی) ئەخوێننەوە، واتە لە جیاتیی (راو) ئەڵێن (یاو)، وەک: ناسیاو، نووسیاو، خوریاو، دزیاو. لە شێوەی ئەردەڵاندا بێجگە لەوە کە پیتی (ر) ئەکەن (ی)، پیتی (ی)یش ئەکەن بە (گ)، وەک: ناسیاگ، نوسیاگ، دزیاگ.

شایانی سەرنجە کە لە شێوەی کەڵوڕیدا لە جیاتیی پیتی (و) لە پاشگری (راو)دا، وەک شێوەی ئەردەڵان پیتی (گ) ئەوترێت وەک: (برجاگ) کە لە سۆرانیدا ئەبێتە برژاو.

لەو چاوگگەلە تێپەڕ و تێنەپەڕە نادیارانەی رابووردوی گێڕانەوە(ماضی نقلی)دا کە نیشانەی بەرکارەکان بریتین لە (راو) و (او)، لە شێوەی هەولێری(سۆران)دا لە جیاتیی پیتی (و)ی نیشانە و پاشگری بەرکار، پیتی(ی) ئەخوێننەوە وەک لاپەڕەی دوایی.

←

## هێلکاری:

| چاوگی کاری تێپەڕ | شێوەی ستاندارد و وێژەیی | شێوەی بەشی ئەنۆری بانە، سەرشیوی سەقز و مەریوان | شێوەی ئەردەڵان |
|---|---|---|---|
| ناسین | ناسراو | ناسیاو | ناسیاگ |
| نووسین | نووسراو | نووسیاو | نووسیاگ |
| مژین | مژراو | مژیاو | مژیاگ |
| تۆقاندن | تۆقێنراو | تۆقێنیاو | تۆقێنیاگ |
| کولاندن(کولاندنەوە) | کولێنراو | کولێنیاو | کولێنیاگ |
| بردن | برراو | بریاو | بریاگ |
| دزین | دزراو | دزیاو | دزیاگ |
| خواردن | خورراو | خوریاو | خوریاگ |
| شێواندن | شێوێنراو | شێوێنیاو | شێوێنیاگ |

دیارە لە چاوگی (خواردن)دا، لە بەر ئەوە کە بێجگە لە پیتی (ر)ی بەرکار، چاوگەکە بۆخۆیشی لە بنەڕەت و بنەمادا خاوەنی (ر)یە، کە واتە بەرکار ئەبێتە (خورراو)، بەڵام لە وتندا تێکەڵ ئەبن و ئەبنە یەک (ر) واتە (خوراو). بەڵام لە شێوەی ناوچەی سەرشیو و زۆر ناچەی تردا لە جیاتیی (ر)ی دووەم، پیتی (ی) ئەخوێنەوە واتە پیتی بنەمای (خواردن) ئەمێنێتەوە و ئەڵێن (خوریاو) و لە سنە و ئەردەڵانیشدا هەر ئەمێنێتەوە و ئەیکەن بە (گ) و ئەڵێن (خوریاگ) و ئەمە نیشانە و بەڵگەی گرنگە بۆ ئەوە کە پیتی (د) لە بەرکاردا بۆ وێنە لە خوردراو، بیندراو، داندراو ... هتد، زیادیە کە لە موکریان و هەولێرەوە سەرچاوەی گرتووە.

هەروا کە وتمان لە شێوەی سۆران (هەولـێری)دا لە رستەی رابووردی گێڕاوەییی تێنەپەڕ و تێپەڕی نادیار(*ماضی نقلی متعدی مجهول*)دا لە جیاتیی پیتی (و)ی پاشگری (راو) و (او)، پیتی (ی) ئەوترێت و ئەمەش هەڵەیە،وەک تابلۆی لاپەڕەی دوایی.

←

هێڵکاری:

| چاوگ | ویژەیی | سۆران(هەولێری) |
|---|---|---|
| گرتن | گیراوە | گیرایە |
| بردن | براوە | برایە |
| خواردن | خوراوە | خورایە |
| کردن | کراوە | کرایە |
| سووتان | سووتاوە | سووتایە |
| برژان | برژاوە | برژایە |

## ناوی بکەری (خوێنـــدکار) هەڵەیە

## (پیتی (د) زیادی یە)

زۆرتری نزیک بە گشتی نووسەران، خوێنەران، وەرگێڕەکان و هۆنەران، بۆ وشەی student یا (جامعی- طلبە) یا (دانشجوو)ی فارسی (étudient)ی فەڕانسەیی، وشە و ئاوەڵناوی بکەری (خوێندکار) بەکار ئەهێنن و ئەمە زۆر هەڵەیە و بە چەند وێنە، ئەم راستی‌یە ئەسەلمێنین:

١-بۆ ناوی بکەری داڕێژراو، سەرەتا رەگی چاوگ ئەنووسین، ئەمجار پاشگری وەک (یار – کار) ی پێوە ئەلکێنین، نموونەکەی لە تابلۆی لاپەڕەی دواییدایە:

هێلکاری:

| چاوگ | ڕەگی چاوگ | پاشگر | ناوی بکەری<br>داڕێژراو یا داڕژاو |
|---|---|---|---|
| فرۆشتن | فرۆش | یار | فرۆشیار |
| زانین | زان | یار | زانیار |
| خوێندن | خوێن | کار | خوێنکار |
| فریودان (هە لفریواندن) | فریو | کار | فریوکار(هەڵفریوێنەر و خەڵەتێنەر) |
| بڕین | بڕ | کار | بڕکار – پەیمانکار – کۆنتراتچی – مقاطعە کار |
| نڤیسین | نڤیس | کار | نڤیسکار(باکووری) |

٢-لە کوردیی باکووریدا هەر بەپێی ئەم تابلۆیە ئەنووسن و ئەخوێننەوە، وەک: نڤیسین کە ئەبێتە نڤیسکار. ئەگەر لە کوردیی باکووریشدا بە هەڵە ناوی بکەری ناوبراو بنووسین، ئەبێ بنووسین نڤیسیکار. بێگومان ڕەگی چاوگی نڤیسین بریتی یە لە (نڤیس). ئەمجار پاشگری (کار)ی پێوە ئەلکێنرێت و ئەبێتە نڤیسکار واتە نووسەر.

کە واتە، نڤیسکار، خوێنکار و بڕکار دروستن نەک خوێندکار. لە هەڵەی ناوی بکەری خوێنکاردا، شێوەی موکریانی زۆر لە شێوەکانی تر شوێنەوار و کاریگەریی هەبووە و ئیستا لە هەموو ناوچەکان و تێلێویزیۆنەکاندا بە هەڵە لە جیاتیی خوێنکار، خوێندکار ئەخوێننەوە و ئەم پیتی (د)ە هەروەک پیتی (د) لە وشەگەلی بیندراو، داندراو ... هتد دا زیادی یە.

٣-بەڕێز دوکتور ڕەفیق محەممەد شوانی کە نووسەری پەرتووکی (ئەو وشانەی لە چاوگەوە وەردەگیرێن)ە، گەرچی لە چەند جێگەدا هەڵەی هەیە، بەڵام خوێنەران ئەتوانن بۆ دڵنیابوون لە هەڵەبوونی خوێندکار، بڕواننە پەرتووکی

ناوبراو، لاپەڕەکانی ٤٠-٥٠-٥١-٩٣ و هتد. شایانی سەرنجە ئەوانەی کە بەهەڵە ئەنووسن خوێندکار، لە جیاتیی ئەوە کە پاشگری کار بلکێنن بە ڕەگی چاوگەوە (خوێن) ئەیلکێنن بە قەدی چاوگەوە (خوێند).

یەکێ لە ڕاستی یەکانی نووسەری بەنرخی ناوبراو، لە لاپەڕەی (٥١)ی پەرتووکی ناوبراودایە کە ڕەخنەی لە نووسراوەکانی عەبدوڵڵا شاڵی گرتووە کە بەهەڵە پاشگری (کار) ی لکاندووە بە قەدی چاوگی (خوێند)ەوە.

بەڵام یەکێ لە هەڵەکانی دوکتور محەممەد شوانی ئەمەیە کە لە کاتێکدا لە لاپەڕەی ٥٤ی ئەو پەرتووکەدا ڕەخنە لە نووسراوەکانی موحەممەد ئەمین هەورامی گرتووە، بۆخۆیشی دیسان جێگەی ڕەخنەیە چونکە نووسیویە (باز) لە وشەی (سەرباز)دا ڕەگی (بازیدەن)ە. بەڵام ئەبێ ئەم ڕاستی یە بڵێین کە ئەوە هەڵەیە چونکە ڕەگی (باختن)ە و(بازیدن)مان نیە و لە بنەڕەتـــدا فارسی‌یە و هەروەها کە وشەی (باز) لە ئاوەڵناوی بکەری (جانباز)دا ڕەگی (باختن)ە وەک دلباز (دلباختن)، خودباز (خودباختن) و ئەمانە ریشە و ڕەگی فارسییان هەیە و ئەتوانین بڵێین ئاوەڵناوی بکەری دارژاوی قرتاو (صفت‌فاعلی‌مرکب‌مرخم)ن. لە جێگەیێکی تردا، وشەی (سەربازیدە)ی بۆ بەرکار هێناوەتەوە بەڵام ئەمەیش هەڵەیە و ئەبێ بنووسین سەرباختە، وەک جان باختە، دلباختە، خودباختە، مالباختە، آبروباختە ... هتد. (سەرباز) لە سەرەتا وبنەڕەتدا کە بکەرە، سەربازەندە بووە وەک (جانباز) کە (جانبازەندە) بووە و (دلباز) کە (دلبازەندە) بوووە و بوونەتە ئاوەڵناوی بکەری لێکدراوی قرتاو ( صفت فاعلی مرکب مرخم ).

## چەند رەخنەی تر لەسەر هەندێ لە نووسەران

بەڕێز دوکتۆر رەفیق محەممەد شوانی لە پەرتووکی (ئەو وشانەی لە چاوگەوە وەردەگیرێن)دا زۆر رەخنەی لە نووسەرانی رێزمانی کوردی گرتووە، بەڵام لێرەدا ئەبێ چەند رەخنەیێ لە خۆیشی بگیرێت. دوکتۆری بەڕێز لە پەرتووکی ناوبراودا لە لاپەڕەی ١٥، لە پەراوێزەکەیدا نووسیویە کە (چاوگی دوورین لە چاوگی دروون باشترە و لە گەرمیاندا بەکارە). دیارە چاوگی دوورین لە ناوچەی ئەردەڵان، سەقز، بابان و هەندێ جێگەی تری ئێرانیشدا قسەی پێ ئەکرێت، بەڵام هەرگیز لە چاوگی دروون باشترنیە چونکە ئەو ناوچە ناوبراوانە کە رت و بڕگەکانی هەندێ وشە و فرمان و چاوگ و ناو بەپێچەوانە بەکار ئەهێنن و وەریان ئەگەڕێننەوە وەک دروون کە ئەیکەن بە دوورین، روانین ئەکەن بە نواڕین، دامەزران ئەکەن بە دامەرزان، بەپێی ئەم تابلۆیە:

| ستاندارد و ویژەیی | شێوەی گەرمیان یا ئەردەڵان و سەقز و ... |
|---|---|
| دروون | دوورین |
| روانین | نواڕین |
| دامەزران | دامەرزان |
| چاوەڕوان | چاوەنواڕ |
| کەروێشک | کەورێشک |
| دەرویش | دەورێش |
| هێنان | هانین |
| جنێو | جوێن |
| تینوو | توونی(بانە و سلێمانی)، تینگ (ئەردەڵان) |
| هێشو | هۆشە |
| قالۆنچە | قۆلانچە |
| رەزاشیرین | زەڕەشیرین (زەڕاشیرین) |

بەڵام ئەمانە وێژەیی و ئەدەبی نین و تەنیا شێوەی زمانی ئەو ناوچەیانەن. ناوی بەرکاری دروون ئەبێتە دروواو. گروون ئەبێتە گرووا‌و. چەند چاوگێک هەن کە ئەگەر ناوی بەرکاریان لێ درووست بکەین، لە دوای ڕەگ یا قەدی چاوگ، دوو پیتی (او) ئەهێنین وەک دروون ( درووا‌و) گروون (گروواو)، سوون (سوواو)، جوون (جوواو) کە ئەمانە لە کاری تێپەڕن. بۆ زۆرتر سەلماندنی ئەم ڕاستی‌یە، ئەبێ بڵێین کە لە چاوگی (دروون)دا ناوی واتایی یا ناوی چاوگ (اسم مصدر)ی (دروومان) هەیە، بەڵام بۆ (دوورین) نیمانە. بۆی هەیە پاشگری (مان) کە بە وشە و ڕەگی چاوگەوە لکاوە، هەر ڕەگ و ڕیشەی فەڕانسەیی هەبێ. ئێمە وشەگەلی لێکدراوی وەک نیشتمان، خرمان لە کوردیدا ئەبینین کە لە زمانی فەڕانسەییدا وشەگەلی پارلمان، ڕاندمان، پانسمان، بۆمباردمان و زۆر وشەی تر پاشگرەکەیان شێوەی پاشگری کوردی ئەنوێنن و زمانی کوردی و زمانی فەڕانسەیی لە زۆر وشەدا هاوبەشن و لە یەکتر ئەچن، وەک ئەم تابلۆیە:

| کوردی | فەڕانسەیی |
| --- | --- |
| مێش | مووش |
| دان (دیان) | دان |
| ئاو | ئۆ |
| پەپوولە | پاپیۆن |
| کوت (لەت) | کووت |
| ئەژنۆ | ژۆنۆ |
| لێو | لیڤر |
| فرۆ(پەنیر) | فرۆماژ |
| تۆ | توو |
| پێ | پیێد |

| کوردی | فەڕانسەیی |
| --- | --- |
| کێ | کی |
| دان (چاوگ) | دۆنێ |
| ڕەگەز | ڕاس |
| دەروو (کۆڵان) | ڕوو |
| کورت | کوورت |
| بریقە – بریکە | بریکە– (چەرخی داگیرساندن) |
| دوو | دوو |
| دووانزە | دووز |
| بەبە (منداڵی ساوا) | بێ بێ |
| پانتۆڵ | پانتالۆن |

ئەو نووسەرە بەڕێزە ناوبراوە لە لاپەڕەی ١٢٧ی هەر ئەو پەرتووکەدا ناوگەلی چاوگی وەک (گەردش، پەرستش، بەخشش، ئالشت، خارشت)ی بە کوردی داناوە، بەڵام ئەمانە هەموویان لە زمانی فارسی یەوە وەرگیراون و پیتی (ش) نیشانەی ناوی چاوگی فارسی‌یە و ئەگەر ئێمە لە کوردیدا بڵێین ئاڵشت، هەڵەیە چونکە نە کوردی‌یە و نە فارسی، بەڵام لە کوردیدا (ئاڵۆش) مان هەیە و بە فارسی پێی ئەڵێن خارش واتە خوروو.

## (ئەبێ) و (ئەبێت)

زۆر کەس لە ناوچە کوردنیشینەکانی رۆژهەڵات و باشووری کوردستاندا چ لە موکریان، چ لە سلێمانی و چ لە گەرمیان، ئەم دوو وشە لە جیاتیی یەکتر بەکار ئەهێنن کە ئەمەیش هەڵەی گەورەیە. با سەیری ئەم دوو رستەی خوارەوە بکەین تا واتای هەرکام لە دوو وشەی (ئەبێ و ئەبێت) یا (دەبێ و دەبێت)مان بۆ روون ببێتەوە.

١-تەمەنی کوڕەکەی کاک رامیار هەشت ساڵ ئەبێت (ئەبێ).

٢-کوڕەکەی کاک رامیار ئەبێ بچێتەوە بۆ فێرگە.

لە رستەی یەکەمدا. (ئەب) واتای کار و کردوەی رانەبووردوو (ئیستا) ئەدات و (ێ) یا (ێت) راناوی لکاوی سێەم کەسی تاقی بزرە.

لەوێدا، (ئەبێ) یا (ئەبێت) واتای (میشود)ی فارسی ئەدەن و لە رەگ و چاوگی to be لە زمانی ئینگلیسی و être لە فەڕانسەییدا واتاکەی دەر ئەکەوێت.

بەڵام لە رستەی دووەمدا کە تەنیا (ئەبێ) ئەنووسرێت و (ئەبێت) نانووسرێت، واتای سووربوون و تەئکیدی هەیە و لە ئینگلیسیدا سێ وشەی (ought to,should,must)مان بۆ ئەمە هەیە و لە فارسیدا پێی ئەڵێن **باید**. ئەمانە کاری سێەم کەسی تاقی بزرن و بە ئینگلیسی پێیان ئەڵێن auxilliaries یا کار و کردەوەی یارمەتی‌دەر و کەم و کوور.

هێنانەوەی نموونەی هەڵە:

١-لە لاپەڕەکانی ١٧٤،١٧٣،٢٥،٢٢ و زۆر لاپەڕەی تری پەرتووکی (زمانەوانی)دا، بەڕێزان سەلام ناوخۆش و نەریمان خۆشناو ، نووسەرانی پەرتووکی ناوبراو تووشی ئەم هەڵەیە بووون.

٢-دوایین دێڕی لاپەڕەی ٣٣ی پەرتووکی (ئەو وشانەی لە چاوگەوە وەردەگیرێن) نووسراوی بەڕێز دوکتور رەفیق محەممەد شوانی.

٣-لاپەڕەی ٢٣، بڕگەکانی ٢ ، ٣ ، ٤ لە (کەرەستە وئامرازەکانی بیرکردنەوە)، لەڕۆژنامەی سیروان ژمارە ٤٧١- چاپی ئێران.

٤-لاپەڕەکانی ٩٥ ، ٩٧ و ١١٤ ی پەرتووکی بە ستانداردکردنی زمانی کوردی، نووسراوی دوکتور رەفیق سابیر.

**روون کردنەوەیێکی تر:**

ئورووپا بەقەد ئاسیا (نابێت)

ئورووپا (ئەبێ) نەوت لە ئاسیا بکڕێت.

**لە رستەی دووەمدا ناکرێت پیتی (ت) بلکێنین بە (ئەبێ)وە چونکە پیتگەلی (ێت) لە رستەی یەکەمدا راناوی لکاوی سێەم کەسی تاقی بزرن و وشەی (نابێ) کار و فرمانی (بوون)ی تیادایە. بەڵام لە رستەی دووەمدا وشەی (ئەبێ) واتای (ought to,should,must)ی هەیە.**

**(نابێت و نابێ) لە رستەی یەکەمدا واتای نمیشود لە زمانی فارسیدا ئەدەن و (ئەبێ) لە رستەی دووەمدا واتای باید لە فارسیدا ئەدات. کەواتە، ئەم دوو وشە واتای جیاوازیان هەیە و نابێ بۆ کاتێ کە واتای (باید)ی فارسی و(should,must,... لە ئینگیسی و (doit) لە فەڕانسەییدا ئەدات، پیتی (ت)ی راناوی لکاوی سێەم کەسی تاقی پێوە بلکێنین. ئەم دوو وشەی (ئەبێ و نابێ) کە ناکرێت پیتی (ت) یان پێوە بلکێنرێت واتای سێ وشەو کردەوەی ئینگلیسی ((oughtto,should,must) و واتای وشەی (باید) لە زمانی فارسیدا ئەدەن و لە ئینگلیسیدا بەو کردەوە و فرمانانە ئەلێن auxilliary verbs، واتە کارە یارمەتیدەر و کەم و کووڕەکان.**

**هەروا کە ئەزانین، کار و فرمانە ئینگلیسی یەکان ئەگەر سێەم کەسی تاقی بزری ئەرێیی هەواڵیی ئیستا بن، پیتی (s) ئەلکێنرێت بەکار و فێعلەکەوە، وەک:**

Bear Likes honey . **ورچ حەز لە هەنگوین ئەکات.**

**بەڵام ئەگەر پیتە یارمەتیدەر و کەم و کووڕەکان بن، ئیتر پیتی (S) یان پێوە نالکێنرێت، وەک:**

**هەستیار ئەبێ ئیستا بڕوات بۆماڵەوە.**

Hastyar must (should) go home, now.

لێرەدا وشەگەلی must و should و تەنانەت کاری go پیتی (S)یان پێوە نەلکاوە و لە وێژەی کوردیشدا وشەی (ئەبێ) پیتی (ت)ی پێوە نالکێنرێت.

## نووسین و وتنی بەهەڵەی ناوی بکەر، ئاوەڵناو، بەرکار و ...

گەلێ جار لە بەرنامەکانی تێلیویزیۆنی سەحەر و جارجار لە بەرنامە کوردییەکانی کوردستانی باشووری یەوە بیستوومە کە هەندێ وشە، ئاوەڵناو و ناوی بکەریان بەهەڵە نووسیوە و خوێندووەتەوە و ئەگەر سەیری ئارشیڤەکانیان بکرێت، بۆمان دەرئەکەوێت کە قسەکەی من لەم بارەوە لە راستەقینە بەدوور نیە. یەکێ لەو هەڵەیانە، ناوی بکەر یا ئاوەڵناوی بکەری (**پشکێنەر**) بووە کە بە تایەبەت **سەحەر تی.ڤی و کوردستان تی.ڤی** لە بارەی کـــۆڕی نەتەوەیەکگرتووەکان و وزەی ناوکــــی یەوە ئەیوت. بەڵام ئەبێ بوترێ **پشکنەر** چونکە نیشانەی ناوی بکەری دارێژراوی (ە ر) لە دوای رەگی چاوگەوە دێت، وەکوو:

پشکنین – پشکن = پشکنەر

ئاخنین – ئاخن = ئاخنەر بڕواننە لاپەڕەی ۱۳۰

ئەمەیش چەند نموونە و هەڵسەنگاندنێک لە چاوگ و ناوی بکەری دارێژراو یا دارژاو:

| چاوگ | ناوی بکەری دارێژراو |
|---|---|
| پشکنین | پشکنەر |
| ئاخنین | ئاخنەر |
| دابەزین | دابەزەر |
| بزواندن | بزوێنەر |

| چاوگ | ناوی بکەری داڕێژراو |
| --- | --- |
| ئاژنین، | ئاژنەر (دیان ئاژن) |
| تێکۆشین، | تێکۆشەر |
| هەڵواسین، | هەڵواسەر |
| دەربڕین، | دەربڕەر (دەربڕ) |
| دادرین، | دادرەر (دادر) |
| سووتاندن | سووتێنەر |
| خۆ رنین، | خۆ رنەر |

لە لاپەڕەی ١١١ی پەرتووکی زمانەوانیدا، بەڕێزان سەلام ناوخۆش و نەریمان خۆشناو ئەم چەند هەڵانەیان نووسیوە کە ئەبێ ڕاست بکرێنەوە:

هێڵکاری:

| چاوگ | هەڵە | دروست و راست کراوەی کارای رابووردووی نادیار |
| --- | --- | --- |
| پاراستن | پاراستراو | پارێزراو |
| پالاوتن | پالاوتراو | پالێوراو |
| خواستن | خواستراو | خوازراو |
| بیستن | بیستراو | بیسراو |
| هاویشتن | هاویشتراو | هاویژراو |
| فرۆشتن | فرۆشتراو | فرۆشراو |

هەروا کە بۆ بەرکاری نادیار وەک خوردراو، بیندراو، هێندراو بەهەڵە پیتی (د)یان نووسیوە، لێرەیشدا پیتی (ت)یان لە کاری نادیاری رابووردووی ئەو چاوگانەدا لەزیادی نووسیوە.

ئەمانەیش هەر وەک چاوگی (گواستنەوە) نووسراون کە لە راستیدا (گوێزانەوە)یە و بەرکارەکەی (گوێزراوە)یە نەک گواستراوە و گوازراوە.

زۆر جار ئەو چاوگانە کە پیتی ( ا) لە ناوەڕاستیاندایە، کاتێ بەرکار دروست ئەکەین، پیتی (ا) ئەکرێت بە پیتی (ی) وەک:

ناردن= نێرراو

ناشتن = نێژراو

راگەیاندن = راگەیێنراو

سپاردن= سپێرراو

لاواندن=لاوێنراو

بەزاندن=بەزێنراو

وەشاندن=وەشێنراو

هەروەها کاتێ ئەیانەوێ لە چاوگی (درێژخایاندن) ناوی بکەر دروست بکەن و بنووسن، ئەڵێن و ئەنووسن درێژخایەن، بەڵام ئەمە هەڵەیە و ئەبێ بنووسین و بڵێین درێژخایێن، و ئەو چاوگانە کە بە (اندن) دروست ئەکرێن، بکەرەکەیان بە (ێن) دروست ئەکرێت، بەم چەشنەی تابلۆکە:

هێڵکاری:

| چاوگ (تێپەڕ) | رەگی چاوگ | ناوی بکەری قرتاو (مرخم) |
|---|---|---|
| خایاندن | خایـ | خاییێن |
| برژاندن | برژ | برژێن |
| سووتاندن | سووت | سووتێن |
| گەیاندن | گەی | گەیێن |
| چەقاندن | چەق | چەقێن |
| بەزاندن | بەز | بەزێن |
| شلەژاندن | شلەژ | شلەژێن |
| خەساندن | خەس | خەسێن |
| لاواندن | لاو | لاوێن |
| بزواندن | بزو | بزوێن |
| خەڵەتاندن | خەڵەت | خەڵەتێن |
| دوواندن | دوو | دووێن |

دیارە ناوی بکەری نەقرتاوی ئەم چاوگانە ئەبنە خایینەر، برژێنەر، سووتێنەر، گەیێنەر، خەسێنەر و ... هتد و ئەگەر دوو پیتی (ە ر) لاببەین، ئەبنە ناوی بکەری قرتاو، واتە اسم فاعل مرکب مرخم.نموونەی هەڵەی ناوبراو، لە لاپەڕەی ٩٣ ی پەرتووکی بەستاندارد کردنی زمانی کوردی، نووسراوی دوکتور ڕەفیق سابیر دا ئەبینرێت.

هەڵسەنگاندن:

| | |
|---|---|
| درێژخایێن(دروست) | Dirêjxayên |
| درێژخایەن(هەڵە) | Dirêjxayen |

## ئاوەڵناو یا ناوی بکەری دارێژاوی (توانا) و پێشگری زیادی و هەڵەی (بە)

چەند ئاوەڵناو یا ناوی بکەری داررێژاو هەن کە لە رەگی چاوگ و پیتی (ا) بەدی و پێک دێن، وەک:

| ئاوەڵناو(ناوی بکەر)ی دارژاو | رەگی چاوگ | چاوگ |
|---|---|---|
| توانا | توان | توانین |
| زانا | زان | زانین |
| بینا | بین | بینین |
| پرسا | پرس | پرسین |
| کۆشا(تێکۆشەر) | کۆش | کۆشین |

(**توانا**) بۆخۆی ئاوەڵناوی بکەر یا ناوی بکەرە، بەڵام بەداخەوە زۆرجار لە زمان و پێنووسی نووسەران و بەرپرسان و وێژەرانەوە ئەبیسین و ئەبینین کە پێشگری(بە) لە گەڵ ئەم وشەیەدا بەکار ئەهێنن و ئەڵێن (بە توانا)!! کەواتە ئەبێ بڵێین **بەبینا**، **بەزانا**، **بەپرسا**!! تەنانەت زۆر جار لەگەڵ وشەی ئاوەڵناوی (ئاگا)دا ئەینووسن و ئەڵێن **بەئاگا**!! جاخۆ ئاگا بۆخۆی سەربەخۆیە و ئیتر بۆچی ئەبێ لە خۆوە پێشگری (بە)ی لەگەڵدا بەکار بهێنن؟

بەرێز دوکتۆر رەفیق سابیر لە لاپەرەی ٧٥ی پەرتووکی بە ستاندارد کردنی زمانی کوردی و ... نووسیــــــویە (**بێ ئاگان**) کە ئەبووایێ بینووســــــیایێ (نائاگان) یا (بێ ئاگادارین) یا (بێ ئاگایین) یا (بێ زانیارین)، چونکە (ئاگا) بۆخۆی ئاوەڵناوە، نابێ (بێ)ی لەگەڵدا بەکار بهێنین. بەڕاستی جێی داخە کە ئەو چەشنە کەسانە سەرنجی ئەم هەڵە گەورانە نادەن و هەستیان پێ ناکەن. ئەوان ئەبێ چاوێک بخشێننەوە بە سەر ئەم تەوەر و چەمکانەدا و چاککاریی لە سەر بکەن.

ئەو ئاوەڵناو (ناوی بکەر)ە ناوبراوانە لەگەڵ زمانی فارسیدا هاوبەشن و هەر ئەو ئەرکەیان هەیە کە لە فارسیدا هەیانە. بێگومان یەکێ لە هۆیەکانی بەکاربرانی (بە) لە پێش (توانا)وە، نەبوونی وردبینییە.

## پاڵ پێوەنەر(مضاف) و پاڵ پێوەنراو (مضافٌ الیە)

ئێمە چەند جۆر (اضافات)مان هەیە وەک: بەیانی (گێڕانەوە)، ملکی (خاوەنایەتی)، تخصیصی (تەرخانی)، استعاری و ... هتد. سەدان و هەزاران جار بیسراوە کە لە ئامێرە پەیوەندیەگشتیەکانەوە لە جیاتیی چەشنی بەیانی و گێڕانەوە، چەشنی خاوەنایەتی و ملکی نووسراوە. بۆ وێنە، لە کوردستانی عێراق و زۆر ناوچەی کوردنشینی تردا ئەڵێن هەواڵەکانی ئابووری، هەواڵەکانی وەرزشی. ئەمانە هەڵەن چونکە واتای ئەوە ئەدەن کە هەواڵەکان لە ژێر (مالکیت) و خاوەنایەتیی ئابووریدان و ئابووری خاوەنی هەواڵەکانە و هەروەها وەرزش خاوەنی هەواڵەکانە. یا ئەڵێن هێزەکانی مارینـز، ڕێبەرەکانی کورد، هێزەکانی فرەنەتەوە. ئەمانە شێوەی وەرگێڕانی فەرهەنگی عەرەبی و فارسین و ئەبێ لە کوردیدا بڵێین هەواڵەئابووری یەکان، هەواڵەوەرزشی یەکان، هێزەمارینـزەکان. واتە ئەبێ پاشگری (کان) کە بریتی یە لە (ک) واتە نیشانەی ناسراو (معرفە) و (ان) کە نیشانەی (کۆ)یە بخرێتە دوایین بەشی وشەی مضاف الیە.

پیتگەلی (ال) لە زمانی عەرەبیدا، نیشانەی ژێر (کەسرە ـــِ) لە زمانی فارسیدا، پیتگەلی of لە ئینگلیسیدا و پیتگەلی de لە زمانی فەڕانسەییدان و نیشانەی (مضاف و مضاف الیە)ن و لە کوردیدا پیتی (ی) ئەم ئەرکەی هەیە و نابێ لە کاتێکدا کە مضاف کۆ (جمع)ە، لە نێوان مضاف و مضاف‌الیە دا بنووسرێت. ئەبێ لاببرێت و (کان) بخرێتە دوای مضاف‌الیە، وەک تابلۆ هێڵکاریی هەڵسەنگێنراوی خوارەوە. بۆمان دەرکەوت کە نابێ لە نێوان (مضاف و مضاف الیە)دا بنووسرێن، چونکە ئەوە ئەبێتە شێوەی وەرگێڕانی فەرهەنگی عەرەبی و فارسی. ئەگەر عەرەب ئەڵێت قوّات المسلّحە، ئێمە نابێ بڵێین و بنووسین هێزەکانی چەکدار. ئێمە ئەبێ بنووسین هێزەچەکدارەکان. بۆمان دەرکەوت کە لکاندنی (کان) بە (مضاف)ەوە، زۆر هەڵەیە.

هەڵسەنگاندن:

| دروست | هەڵە |
|---|---|
| هەواڵە ئابووریەکان | هەواڵەکانی ئابووری |
| هەواڵە وەرزشیەکان | هەواڵەکانی وەرزشی |
| هێزە فرەنەتەوەکان | هێزەکانی فرەنەتەوە |
| هێزە مارینـزەکان | هێزەکانی مارینـز |
| رێبەرە کوردەکان | رێبەرەکانی کورد |
| هێزە میلیشیاکان | هێزەکانی میلیشیا |
| هێزە چەکدارەکان | هێزەکانی چەکدار |
| وڵاتە عەرەبیەکان | وڵاتەکانی عەرەبی |
| گرووپە عێراقیەکان | گرووپەکانی عێراقی |

بەڕاستی جێی داخە کە زۆر کەس فەرهەنگی زمانی کوردی ئەکەن بە عەرەبی و ئامادەی ئەوە نین کە نەختێ خۆیان بخەنە ماندوویەتی و شەکەتی و بیر لە وەرگێڕانی رستە و وشەکان بکەنەوە و بە گوێرەی عەرەبی، تورکی و فارسی و زمانەکانی تر (تحت اللفظی) وەریان ئەگێڕنەوە. ئەمانە وەرگێڕان نین. ئەمانە ئەبێ ناویان بنێین هەڵگێڕانەوە و وەرگەڕاندنی کوردی و گۆڕینی فەرهەنگی رەسەنی کوردی بۆ سەر فەرهەنگی هەندەران و بێگانە و دەرەکی، یان بە پێچەوانە، گۆڕینی فەرهەنگی ئەوان بۆ سەر کوردی، بە شێوەی راستەوخۆ یا ناڕاستەوخۆ.

جێی سەرنجە کە زۆر جار نووسەران و وێژەران پیتی (ی)ی پاڵپێوەنەر و پاڵپێوەنراو لە پێنووس ئەخەن و نایننووسن و ئەمە ئەبێتە هۆی ئەوە کە واتای رستەکە بگۆڕێت و لەو کاتەدا کە پیتی (ی) کە لە نێوان پاڵپێوەنەر و پاڵپێوەنراودا هەڵ‌ئەکەوێت، دوایین پیتی پاڵپێوەنەر (ی) بێت و بە دەم و زماندا هێنانی دو (ی) لە پاڵ یەکتردا گران و سەختە.

بەڵام ئەبێ ئەم پیتی (ی)یە لە رستە و نوسراوەکاندا، چ بە پیتگەلی عەربی بن و چ بە پیت‌گەلی لاتین، بنووسرێت وەگینا واتای رستەکە ئەگۆڕێت وەک ئەم پاڵپێوەنەر و پاڵپێوەنراوانەی رستەکانی هێڵکاریی لاپەڕەی دوایی.

←

| واتا (بە زمانی ئینگلیسی) | پاڵپێوەنەر و پاڵپێوەنراو (بە پیتگەلی عەرەبی و لاتین) |
|---|---|
| The mayor of Baneh was angry, today. | ئەمڕۆ شارەوانی بانە تووڕە بوو. Emrro şarewanî Bane tûrre bû. |
| The municpality of Baneh was noisy(crowded),today. | ئەمڕۆ شارەوانیی بانە قەرەباڵغ(پڕئاپۆرە) بوو. Emrro şarewanîy Bane qereballix (pirr apore) bû. |

لە رستەی دووەمدا پێویستە بێجگە لە (ی)ی دوایین بەشی پاڵپێوەنەر، پیتی (ی)ی دووەم کە بەرانبەر لەگەڵ (of)ی ئینگلیسی و (الـ)ی عەرەبی و (du یا de)ی فەڕانسەیی یە، بنووسرێت وەگینا لەوانەیە واتای وشە و رستەکان بە نەنووسرانی پیتی ناوبراو واتە (ی) نەگۆڕرێت و مرۆڤ لە کاتی خوێندنەوەیان بە پیتگەلی لاتین و عەرەبی تووشی هەڵە و سەرلێشێواوی ببێت.

ئەو چاوگ و ئایدیۆمە دارژاوە تێپەڕانە کە بە پێشگری وەک تێ، پێ، لێ دەست پێ ئەکەن.

لە کاتی بە کارهێنانی ئەم چەشنە چاوگ و ئایدیۆمانە لە رستەدا، پێشگرەکە لائەچێت و پریپۆزیسیۆنی پێویست لە پێش بەرکاردا ئەنووسرێت و ئەوترێت، وەک:

| |
|---|
| تێ گەییشتن = لە یەکتر گەییشتن. (تێ) لابراوە |
| رێزلێنان = رێزنان لە شەهیدان . (لێ) لابراوە |
| دیان پێدانان = دیان نان بە راستەقینەدا. (پێ) لابراوە |

لەبەر ئەوە کە پریپۆزیسیۆنەکە واتای پێشگرەکانی تێدایە، ئیتر لە بەشی دووەمدا نایینوسینەوە و نایلێینەوە، بەڵام گەلێ جار تەنانەت زاناکان بە شێوەی هەڵە بەکاریان ئەهێنن و ئەڵێن و ئەنووسن:

رێز لێنان لە شەهیدان. تێگەییشتن لە یەکتر. بەڵام پریپۆزیسۆنی (لە) واتای (لێ) و (تێ) ئەدات و ئیتر وتن و نووسینەوەی لە بەشی دووەمی رستەکەدا هەڵەیە.

نموونەی هەڵەکان:

شەوی ١٣/١٢/٢٠٠٨ لە سەر ١٤/١٢/٢٠٠٨ تێلێویزیۆنی کوردسات لە هەواڵەکانی خۆیدا بە پیتگەلی لاتین لە سەر تەختاییی شووشەی تێلێویزیۆندا نووسیبووی:

Rêzlênan le şehîd

بەڵام دروستەکەی ئەمەیە: Rêznan le şehîd

چونکە (le) واتای ( لێ – lê ) ئەدات و نابێ دووبارە بکرێتەوە. هەروەها لە شەوی ٢٧/١٢/٢٠٠٨ لە سەر ٢٨/١٢/٢٠٠٨دا هەر تێلێویزیۆنی ناوبراو لە بەرنامەکەی خۆیدا کە بۆ رێزنان لە هونەرمەند زەکەریا تەرخان کرابوو، نووسیبووی:

Merasîmî rêzlênan le hunermendî kurd zekerya

کەئەبووایێ بینووسیایێ

Merasimi rêznan le hunermendî kurd, zekerya

شەوی ٢٠/١١/٢٠٠٨ لە سەر ٢١/١١/٢٠٠٨ تیلیڤیزیۆنی کوردسات لە هەواڵەکانیدا لە بارەی ١٥٠ تەرمی شەهیدانی ئەنفالەوە وتی و (بە پیتی عەرەبی نووسیبووی):

«ڕێوڕەسمی ڕێزلێنان لە ١٥٠ روفاتی شەهیدی ئەنفالکراوی گەرمیان .»

بەڵام ئەبووایێ بینووسیایێ «ڕێوڕەسمی ڕێزنان لە ١٥٠ رووفاتی شەهیدی ...»

هەروەها لە شەوی ڕێکەوتی ٦/١٢/٢٠٠٨ لە سەر ٧/١٢/٢٠٠٨دا هەر تێلێویزیۆنی کوردسات نووسیبووی ڕێزلێنان لە شەهیدان، بەڵام دروستەکەی ئەمە بوو: ڕێزنان لە شەهیدان، چونکە لە بەشی دووەمی رستەکەدا (لە) واتای لێ ئەدات و نابێ دووبارە بکرێتەوە و بنووسرێتەوە.

## هەڵەی فۆنێتیکی و گۆڕینی پیت

یەکێ لە نادروستی و هەڵەکانی زۆر کەس لە کوردەکانی باشور (عێراق) ئەمەیە کە پیت و دەنگی زۆر وشەی دەرەکی و کوردی کە ناوی تایەبەتن، ئەگۆڕن.

بۆ نموونە، ناوی (بووش) بە (بۆش) ئەخوێننەوە، لە حالێکدا بووش بە لاتین بەم شێوە ئەنووسرێت: (Bûş) و بۆش بەم شێوە ئەنووسرێت: (Boş). یا وشەی گومروک ئەکەن بە گوومرک.

هەڵسەنگاندن:

| دروست | | هەڵە | |
|---|---|---|---|
| گومروک | Gumruk | گوومرک | Gûmirik |

وشەی یەکەم، واتە وشەی (بۆش) زۆرتر لە سەردەمی جۆرج بووشدا ئەوترا.

یا هەندێ ناوی تر وەک خاتوو بووتۆ کە زۆر جار لە کاتی کوژرانی ئەودا لە هەواڵەکاندا بە (بۆتۆ) ئەخوێنرایەوە.

لاتینی بووتۆ ئەمەیە: (Bûto)، بەڵام لاتینی بۆتۆ ئەمەیە:(Boto)، گەرچی بەئینگلیسی ئەنووسن Bhutto.

یا بە ئۆتۆمۆبیل ئەڵێن ئۆتۆمۆبێڵ یا ترۆمبیل، بە ئیزگە ئەڵێن ئێزگە. گەرچی ئەمە لە وشەی (ایستگاه) لە فارسیەوە وەرگیراوە. تەنانەت لە جیاتیی بژیو ئەنووسن بژێو.

لە بەشەکانی پێشوودا باسی بژیومان کرد کە لە وشەی ژین و ژیانەوە هاتووە.

هەڵسەنگاندنی چەشنی دیکتەی لاتین:

| | |
|---|---|
| بژیو (دروست) | Bijîw |
| بژێو (هەڵە) | Bijêw |

هەروەها بە مووسیقا ئەڵێن مۆسیقا، تەنانەت لە ئینگلیسیدا ئەنووسن Music (میوزیک) و فارسەکانیش ئەڵێن مووسیقی و لەزمانی فەڕانسەییدا ئەڵێن moozik.

یان بۆ وشەی ئیستا ئەنووسن ئێستا.

ئەم هەڵەی دەنگ و فۆنێتیکە لە شێوەی زمانی ئەردەڵانیشدا زۆرە، وەک:

| فۆنێتیکی ستاندارد | فۆنێتیکی ئەردەڵان |
|---|---|
| فیل | فێڵ |
| پەنیر | پەنێر |
| کەفیل (عەرەبی) | کەفێڵ |
| وەکیل (عەرەبی) | وەکێڵ |
| کلیل | کلێڵ |
| رەفیق (عەرەبی) | رفێق |

| دیو (هۆده و ژوور) | دێو |
|---|---|
| گیسک | گێسک |
| سووک | سۆک |
| خوشک | خۆشک |
| هەنگوین | هەنگوێن |
| بەخیل (عەرەبی) | بەخێڵ |
| ریقنە | رێقنە |
| ریخ | رێخ |
| میز | مێز (گمێز) |
| گوریس | گورێس |

شایانی باسە لە ناوچەی ئەردەڵاندا زۆرجار خەڵک هەندێ وشەی کوردیی رەسەن بەگشتی ئەگۆڕن. ئێمە وشەی (فرە)مان هەیە کە زۆر کۆن و دێرینە و فرەبەش، فراوانخواز، فرەنەتەوە، بەرفراوان، فرەڕەگەز و زۆر وشەی تر لەم وشەوە وەرگیراون.

تەنانەت ناوێک وەک فەریبۆرز لە فارسیدا، لە دوو وشەی (فرە) و (بەرز) پێک هاتووە واتە زۆر بەرز. یا ناوی فرەوەرتیش. تەنانەت وشەی فَرزانگان لە زمانی فارسیدا کە واتای علّامە ئەدات، لە دوو وشەی (فرە) و (زانەکان)ی کوردی یەوە وەرگیراوە واتە فرەزانەکان. لە ئەردەڵاندا وشەی (فرە)یان زۆرە بەڵام چەندین ساڵێکە ئەگەر بڵێن فرەتر (واتە زۆرتر) ئەڵێن بیشتر، واتە وشەی فارسی بەکار ئەهێنن و ئەمەیش بێجگە لە کارتێکران لە زمانی فارسی یەوە، سنەییەکان بۆخۆیشیان پێیان خۆشە وشەی فارسی بەکار بهێنن و خۆیان لێگۆڕیوە و ئەمڕۆ ئەگەر کوردێکی سنەیی بچێت بۆ هەولێر یا سلێمانی، بۆی هەیە پێویستیی بە وەرگێڕی شێوەی زمان هەبێ. دیارە نەتەنیا هەولێری، بەڵکوو تەنانەت کوردێکی

خەڵکی سلێمانی نازانێ واتای رستەی (مەورد ئیستعمال قەرار دریاگە) چیە و ئەبێ کەسێک وەری بگێرێتەوە و بڵێت واتە: کەڵکی لێ وەرگیراوە، یا: سوودی لێ وەرگیراو. یا: بەکار هێنراوە.

یا وشەی (شنەوەندە) وەرگێڕێتەوە سەر (بیسەر). ئیستا سنەیی بێجگە لە پریپۆزیسیۆنەکان، زۆربەی وشەکانیان فارسی و عەرەبی یە.

## هەڵەی (و)ی عَطف بە پیتی لاتین

پیتی واوی عطف کە دوو وشەو دوو رستە بە یەکترەوە پەیوەند ئەکات، لە کوردیی پیتی لاتیندا بە دوو جۆر بە کار ئەهێنرێت. جاری وا هەیە کە بە پیتی لاتین ئەبێ û بنووسین و جاری وایش هەیە ئەبێ w بنووسین. ئەگەر دوایین پیتی پێش (و) لە چەشنی بێدەنگەکان بێت، ئەبێ û بنووسین وەک:

| | |
|---|---|
| دار و بەرد | Dar û Berd |
| کوڕ و کچ | Kurr û kiç |
| دەست و پل | Dest û pil |
| کورد و کوردستان | Kurd û Kurdistan |

بەڵام ئەگەر دوایین پیتی وشەی پێش (و) لە چەشنی دەنگدارەکان بیت، w ئەنووسین، وەک:

| | |
|---|---|
| درۆ و دەلەسە | Diro w Delese |
| گۆرەوی و پێڵاو | Gorewî w pêllaw |

| ئالا و سەربەخۆیی | Alla w serbexoyî |
| --- | --- |
| عەلی و ئاوات | Elî w Awat |
| لێرە و لەوێ | Lêre w Lewê |

بە داخەوە لە کورستانی باشووریدا و تەنانەت لە زۆر جێگەی تردا هەردووکیان بەیەک جۆر (û) ئەنووسن و جاری وا هەیە (u) ئەنووسن.

## نموونەی هەڵەکان

شەوی ٢٥ لە سەر ٢٦ ی ١١/٢٠٠٨، تێلێویزیۆنی کوردسات لە هەواڵەکانی خۆیدا لە بارەی توندوتیژی لە شنگار و کوژرانی چەند کەسەوە، بە لاتین نووسیبووی:

Tundutîji u Alozî

کە ئەبووایێ بینووسیایێ:

Tundûtîjî w Allozî

لە ڕێکەوتی شەوی ٦/١٢/٢٠٠٨دا کوردسات لە بەشی هەواڵەکاندا لە سەر شاشە (تەختایی)ی شووشەی تێلێویزیۆندا نووسیبووی:

Yekêtî û Nwêbûnewe

کە ئەبووایێ بینوسیایێ :

Yekyêtî w Niwêbûnewe

گەرچی یەکێتی هەڵەیە و ئەبێ یەکیەتی یان یەکییێتی بنووسرێت. یەکێ لە هەڵە گەورە و بەرچاوەکان، ڕستەی (لێرە و لەوێ)یە کە لە سەر شاشەی تێلێویزیۆنی کوردستان تی.ڤی بڵاو ئەکرێتەوە و ئەنووسرێت:

Lêre û lewê

بەڵام ئەبێ ئاوا بنووسرێت و بنووسرایێ:

Lêre w lewê

دیاره لێره و لەوێ بەرنامەیێک بوو کە بڵاو ئەکراوە و ئیستایش لە کاتی نووسینی ئەم پەرتووکەدا بڵاو ئەکرێتەوە.

لە ڕێکەوتی ١٤/١٢/٢٠٠٨ لە سەر ١٥/١٢/٢٠٠٨ دا لە سەر شاشەی تێلێویزیۆنی کوردسات بە پیتی لاتین نووسرابوو:

Pirse u matemînî

بەڵام ئەبووایێ بنووسرایێ:

Pirse w matemînî

هەندێ وشەی‌تر هەن کە لە کوردستان و بە تایەبەت لە کوردستانی باشووریدا بەهەڵە پیتی زیادییان پێوە ئەلکێنن وەک وشەی کوردستان کە ئەنووسن کوردوستان و پیتی (و) زیادی‌یە و هەر کەس بە ئارەزووی خۆی ئەمانە ئەگۆڕێت، وەک:

| هەڵە | دروست |
| --- | --- |
| کوردوستان | کوردستان |
| سوپا – سووپا | سپا |
| سوپاس | سپاس |
| بە ئاگا | ئاگا |
| بە توانا | توانا |

یا هەندێ جار ئەو وشە زیادییانەی کە لە زمانی عەرەبیدان، وەرئەگێڕنەوە سەر کوردی، بۆ نموونە وشەی (ئەمە) کە لە عەرەبیدا ئەڵێن (هذا) و لە نێوان دوو ڕستەدا دێت و ئیتر لە کوردیدا پێویست ناکات (ئەمە) بنووسرێت چونکە

لەکوردیدا ئەو وشە ناوترێت و تەنیا تایەبەتی فەرهەنگی عەرەبیە. یا ئەڵێن و ئەنووسن هەڵستا واتە تاوی دایە کارێک.

لە دوای رستەکە، ئەڵێن ئەمە و (واتە هذا) چونکە ئەمە لە فەرهەنگی کوردەواریدا نیە.

لە میدیا و تیلیویزیۆنەکانەوە زۆر رستە بە کار ئەهێنرێن کە واتای راستەقینەی مەبەست و ئامانجەکە ناگەیێنن و یا لە باری رێزمانەوە هەڵەن. نموونەی ئەمانە، بریتین لە: **ئاگاداری ئاسۆ ئەکەین.** ئەمە زۆر هەڵەیە و ئەبێ بنووسین (ئاسۆ ئاگادار ئەکەین)، چونکە ئاگادار بەرکار و ئاوەڵناوە و نابێ لە سەرەتای رستەکەدا بێت و ئەبێ لەگەڵ ئەکەین و لە دوای (ئاسۆ)وە بنووسرێت چونکە ئاگادارکردن کار وکردەوەی (مرکب)ە. یا ئەڵێن بۆ بەگژداچوونەوەی تیرۆر کە واتای ئەمە ئەدات کە تیرۆر بکەر بێت و بەگژدا بچێتەوە و راست و دروستەکەی ئەوەیە کە بڵێن بۆ بەگژ تیرۆڕدا چوونەوە یا: بۆ چوونەوە بەگژ تیرۆڕدا.

هەروەها ئەم رستەیە هەڵەیە کە ئەنووسن:

بۆ بە دوادا چوونی مەسەلەکە.

لەم رستەیەدا مەسەلەکە بکەرە و باشترە بڵێین: بۆ چوون بە دوای مەسەلەکەدا، یا: بۆ بەدوای مەسەلەکەدا چوون.

لە رێکەوتی ٦/١/٢٠٠٩ دا لە سەر شاشەی تیلیویزیۆنی کوردساتدا بە پیتگەلی لاتین نووسرابوو:

Bedwadaçûnî piroje

بەڵام ئەبوایێ بنووسرایێ:

Bo Bedway pirojeda çûn

یان بینوسیایێ:

Bo çûn Bediway pirojeda

چونکە لێرەدا بە دواداچوونی پڕۆژە واتاکەی ئەوەیە کە پڕۆژە بکەر بێت و بە دوادا بچێت، هەروەها ئەبێ (بەدوای) بەم چەشنە بنووسرێت:

Bediway

گەلێ جار هەندێ رستە لە تێلێویزیۆنەکانەوە بیسراون و بینراون کە واتای راستەقینە ناگەیێنن، وەک ئەم رستە کە لە ساڵی ۲۰۰۸ لە سەر شاشەی یەکێ لە تێلێویزیۆنەکاندا نووسرابوو: سەردانی خانەقین.

لەو کاتەدا کە خەریکبوو لە دەوروبەری خانەقین ئاژاوەی سەربازی سەر-هەڵبدات، بەرپرسە مەدەنی و سەربازی‌یە کوردەکان سەریان لە خانەقین ئەدا. بەڵام لە رستەی سەردانی خانەقین دا مرۆڤ وا ئەزانێ کە خانەقین سەری لە جێگەیێک دابێ و خانەقین بکەربێت.

ئەبوایێ بنووسرایێ: سەردان لە خانەقین و ئیتر لێرەدا خانەقین وەک بکەر خۆی نانوێنێ و ئەبێتە بەرکار و ئاوەڵناوی جێگەیە و ئەبێ پریپۆزیسیۆنی (لە) بەکار بهێنرێت.

لە کاتی بڵاوکرانەوەی هەندێ هەواڵدا، لەجیاتیی ئەوە کە ناوی ئەو کەسە، یان ئەو جێگە یان ئەو شتە کە لە هەمووی گرنگترە، لە سەرەتای رستەکەدا بنووسرێت و بخوێنرێتەوە، ئەچن فرمان و کار و کردەوە و شتی تر لە سەرەتادا ئەهێنن، وەک:

لە دیدارەکەیدا بۆ سلێمانی، سەرۆک کۆمار

کە هەڵەیە و ئەبێ سەرۆک کۆمار لە سەرەتای رستەکەدا بنووسرێت و بخوێنرێتەوە، بەم پێیە: سەرۆک کۆمار لە دیدارەکەیدا بۆ سلێمانی ....

یا جاری وا هەیە کە ناوی جێگا ئەخرێتە دوایین بەشی رستە و ئەمەیش زۆر نادروستە، وەک:

سەرۆک وەزیران پێشوازیی لە وەزیری دەرەوەی ئەمریکا کرد لە بەغدا.

ئەبێ ئەم رستە بەم چەشنە چاک بکرێت:

سەرۆک وەزیران لە بەغدا پێشوازیی لە وەزیری دەرەوەی ئەمریکا کرد. ئەبێ کار و کردەوەی (کردن) بخرێتە دوای ئەمریکا. ئایا بۆچی ئەبێ رستەکان بە پێی فەرهەنگی زمانی عەرەبی وەربگێڕرێنەوە؟ ئاوەڵکاری جێگا و کات، هەروەها بەرکار ئەخەنە داویین بەشی رستەکان. بەڵێ، هەرکەسێک بە ویست و ئارەزووی خۆی کار ئەکات. زۆرتری نووسراوە و هەواڵ و وەرگێڕاوەکانی کوردستانی باشوور بە پێی فەرهەنگ و لە سەر رێزمانی عەرەبی ئەنووسرێن و بەم شێوە زەبرێکی هەرە گەورە کە شایانی قەرەبووکرانەوە نیە، لە فەرهەنگ و زمان و کەلەپووری کوردی ئەدەن.

لە رێکەوتی سێشەممە ٢٨ لە سەر ٢٩ی ئۆکتۆبری ٢٠٠٨دا کوردسات لە بەشی هەواڵەکانی شەودا بە کوردیی لاتین نووسیبووی:

Kardanewe

ئەمجار ئەم رستەیە ئەبینرا و ئەخوێنرایەوە:

سنوور بڕینی سووریە.

واتە ئەو کاتە کە ئەمریکا هێرشی ئاسمانیی بردە سەر خاکی سووریە، لە سەر تەختاییی تیلیویزیۆنی ناوبراودا نووسرابوو:

چەند لێدوانێک لە بارەی سنووربڕینی سووریە.

ئەو رستە زۆر هەڵە بوو و مرۆڤ وا تێ ئەگەییشت کە سووریە بکەر بێت و سنووری عێراقی بڕیبێت.

ئەبووایێ بنووسرایێ (چەند لیدووانێک لە بارەی بڕینی سنووری سووریە وە). یا بینووسیایێ بڕینی سنووری سووریە. لە نووسراوەی تیلیویزیۆنەکەدا سووریە ببوو بە (بکەر)، بەڵام لە راستەقینەدا ئەمریکا بکەر بوو و سنووری سووریەی بەزاندبوو و سنووری سووریە بڕابوو.

شەوی ١٠/١١/٢٠٠٨ لە سەر ١١/١١/٢٠٠٨، کوردسات لە بەرنامەی ژیانی خەڵکی ئامازۆندا وشەی (هێندی)ی بە کار هێنا. دیارە ئەمریکاییەکان بە سوورپێستەکان ئەڵێن ئیندیەنز. لە وەرگێڕانەکەی بەرنامەی ناوبراودا دەرئەکەوت کە وەرگێڕەکە وای زانیوە وشەی The Indians واتای هێندی و هێندوستانی ئەدات، بەڵام ئەبووایێ ئەو وشەی بە (سوورپێست) وەربگێڕایێ نەک بە هێندی.

ئەمەیش وەک بەور (بەبر) و پڵنگەکە بوو کە لە بەشی سەرەتادا باسمانکرد و لە جیاتیی بەبر، بە (پڵنگ) وەریانگێڕابووەوە. ئەمە بێجگە لە ناشارەزایی، نیشانەی زاڵکرانی فەرهەنگی عەرەبییە.

بە داخەوە تەنانەت لە جیاتیی رەقە واتە کیسەڵی ناو ئاو، هەر کیسەڵ ئەنووسن. رەقە لەگەڵ کیسەڵ جیاوازە. لە رێکەوتی ٥/١/٢٠٠٩ دا یەکێ لە تیلیویزیۆنەکان

(له بیرم نه‌ماوه که ئایا کوردسات بوو یان کوردستان تی .ڤی) هه‌ر له باره‌ی فیلمی وه‌کووخۆی (مستند)ی لێواره‌کانی چه‌می ئامازۆنه‌وه ئه‌یوت هێندیه‌کان و دیسان به هه‌ڵه وشه‌ی (هێندی)ی به کار ئه‌هێنا چونکه له زمانی ئینگلیسیدا هه‌روا که وتمان وشه‌ی The Indians واته سوورپێسته‌کان نه‌ک هێندیه‌کان.

له ڕێکه‌وتی شه‌وی ۲۵ له سه‌ر ۲٦ی ئوکتۆبری ۲۰۰۸ دا تێلێویزیۆنی زاگرۆس له به‌شی هه‌واڵه‌کاندا وتی و نووسیبووی:

هاوکاری کردنی مه‌سیحیه‌کان.

ئه‌مه له‌و کاته‌دا بوو که مه‌سیحی یه‌کان له مووسڵدا هه‌ڕه‌شه‌ی کوشتنیان لێکرابوو و به‌سه‌ر شاره‌کانی هه‌رێمی کورستاندا ئاواره ببوون. ئه‌بووایێ بنووسرایێ هاوکاری کردن **له‌گه‌ڵ** مه‌سیحیه‌کاندا. ئه‌مه له کاتی یارمه‌تیی مانگی سوور و دانی شت و یارمه‌تی به ئاواره مه‌سیحی‌یه‌کاندا بڵاوکرایه‌وه.

هاوکاری کردنی مه‌سیحی یه‌کان واتای ئه‌وه ئه‌دات که مه‌سیحی‌یه‌کان هاوکاریی کورده‌کانیان کردبێ و له‌و رسته‌یه‌دا مه‌سیحی‌یه‌کان بکه‌ر و هاوکار و یارمه‌تیده‌رن به‌ڵام له راسته‌قینه‌دا کورده‌کان بکه‌ر و مه‌سیحی‌یه‌کان به‌رکار بووون و ئه‌مه‌یش وه‌رگێڕانێکی زۆر هه‌ڵه و ناشاره‌زایانه بوو.

## وشه گه لی رابووردوو، رابووران، رابووردن، رابوواردن و لێبووردن

ئەم وشانە کە بەرکار و چاوگن، چەشنی نووسینەکەیان دروستە، بەڵام وشەگەلی رابردوو، رابردن، رابران ... هتد هەڵەن چونکە لە پێش دوایین پیتی رەگی چاوگدا ئەبێ دوو پیتی (وو) بنووسرێت و هەموویان لە بنەڕەت و چاوگەوە دوو پیتی (وو)یان هەیە کە پیتی بنەما و ریشەی کار و وشەکانن، بەڵام زۆر جاران بەهەڵە پیتگەلی (وو) نانووسرێن و لە جیاتیی ئەوانە، پیتی نیوەبزوینی (بزرۆکە) i ئەنووسن، گەرچی کورتە بزوێن بەلاتین لە نووسینی پیتی عەرەبیدا تیایدانیە وەک:

رابردوو Rabirdû

کە هەڵەیە و ئەبێ بەم چەشنە بنووسرێت:

رابووردوو Rabûrdû

نموونەی هەڵەکان، ئەم رستەیە بوو کە لە رێکەوتی شەوی ۹ لە سەر ۱۰ی نۆڤامبری ۲۰۰۸دا تیلـیویزیۆنی کوردسـات لە بەشی هەواڵەکانـدا لە بارەی ئەشکەوتی داری خـلەوە (darî xile) لە کـەلار کە کەلوپەلی بەجێ ماوی پێشمەرگەی شەهیدی پیشان ئەدا، بە لاتین لە سەر تەختاییی شووشە ئاوای نووسیبوو:

Rûdawêkî rabirdû

کە ئەبووایێ ئاوای بنووسرایێ

Rûdawêkî rabûrdû

واتە ئەبووایێ لە جیاتیی پیتی نیوە بزوێنی i ، پیتی û بنووسرایێ.

**لە هەندێ رستەدا واتا و مەبەست ئەگۆڕرێت و واتا و مەبەستی تر ئەدەن، وەک ئەمە کە زۆرجار لە کوردستانی باشووریدا لە بارەی ئاوارە و زیانلێکەوتووەکانەوە ئەنووسن و ئەڵێن: قەرەبووکردنەوەی ئاوارەکان.**

**(ئاوارە) مرۆڤە و مرۆڤ قەرەبوو ناکرێتەوە، بەڵکوو زیانەکان قەرەبوو ئەکرێنەوە و دروستی رستەکە ئەمەیە:**

**قەرەبوو کردنەوەی زیانەکانی ئاوارەکان.**

**چونکە قەرەبوو بۆ ئاوارەکان ئەکرێتەوە و ئاوارەکان قەرەبوو ناکرێنەوە، زیانەکان قەرەبوو ئەکرێنەوە.**

**زۆر وشە هەن کە لە زمانەکانی وڵاتانی هەندەرانەوە هاتووونەتە ناو زمای کوردی و دەرەکین و رەنگە سەرەتا هاتبێتنە ناو زمانی عەرەبی، ئەمجار هاتبێتنە ناو زمانی کوردی، بەڵام عەرەبەکان شێوە و چەشنی وشە و پیت ودەنگ و ئاهەنگ و هەوای زۆر لەو وشـــــانەیان گۆڕیوە، وەک:پارلــــمان کە کردوویانە بە (بَرلَمان) و کوردەکانیش هەر لە سەر ئەو کێش و ئاهەنگەی زمانی عەرەبی ئەیانڵێن وەک:پەرلەمان. جاخۆ پاڕلمان لە زمانی فەڕانسەییدا لە دوو وشەی (پارل) یا پارلێ (پاغڵێ) = parler واتە قسەکردن و (مان) کە پاشگرە، پێک هاتووە و بەم شێوە ئەوترێت: پاڕلێمان (پاغلێمان) واتە قسە و وتووێژ کردن و جێگەی وتووێژ. بەڵام بۆچی کوردەکانی باشوور لە جیاتیی پاڕلمان، ئەڵێن پەرلەمان؟ ئەمە هەڵەیە و تەنانەت بەرێوەبەرێکی بەرنامەی هونەری لە سالی ۲۰۰۸ دا لە جیاتیی مۆدێڕن، ئەیوت مۆدرێن!! یا زۆر جار بە ژاپۆن ئەڵێن یابان. خۆ ئەمان عەرەب نین کە**

زمانەکەمان لە پیتگەلی ژ- پ – گ – چ- ڤ و... بێ بەش بێت. یا بە بوورژوازی ئەڵێن بوورجوازی و بە تێلێڤیزیۆن ئەڵێن تەلەفزیۆن. وشەی (مووزە) لە زمانی فەڕانسەییەوە هاتووە و ئینگلیسی‌یەکان ئەڵێن میوزیێم museum بەڵام لە کوردستانی عێراق ئەڵێن مۆزەخانە. لە کوردیدا مۆز شتێکی ناشرین وەک ئەوە کە ئەڵێن: وەڵاخەکە مۆزی کردووە. مۆز ناوی دەعبایێکی پێوەدەرە.

هەندێ وشەی کوردی بە ئارەزووی هەندێ کەس گۆڕاون بۆ وێنە، بە (کایا) ئەڵێن کایە. وشەیێکی زۆر گرنگ هەیە کە بەراستی کوردەکانی سەر تێلێویزیۆنەکان لە بیری خەڵکیان بردووەتەوە و ئەوەیش وشەی (بێجگە) یە و تەنیا (جگە) بە کار ئەهێنن و لە سەد جاریشدا جارێک ناڵێن بێجگە و بەرەبەرە ئەم وشەیان لە بیری دانیشتووانی کوردستانی رۆژهەڵات بردووەتەوە.

مەگەر تەنانەت مامۆستا حەسەن زیرەکی بۆکانی ناڵێت؟:

«قەت نەبوو بێجگە لە ناخۆشی بەشم، هەر تووشی گێرە و... م.»

ئایا هۆی چیە کە خوێنەران و وێژەرانی رادیۆ و تێلێویزیۆن، تەنانەت جارێک بۆ دەرمان بە کاری ناهێنن و تەنیا مەیل و ویست و سەلیقەی خۆیان و وشەی ناوچەکەیان بەکار ئەهێنن و زۆر وشە لە بیری خەڵک ئەبەنەوە. یا وشەی (لەمەوبەر) بە کار ئەهێنن و پیتی (ە) لا ئەبەن و دیارە لەمەوبەر شێوەی ئەردەڵان و گەرمیان و بابانە وئەبێ بنووسرێت لەمەوەبەر واتە لە مەپێش.

دوو مانگ لە مەوبەر چووم بۆ لای دوکتۆر (ئەردەڵان و شارەزوور و گەرمیان).

دوو مانگ لە مەوە بەر چووم بۆ لای دوکتۆر (وێژەیی).

دوو مانگ لەمەپێش چووم بۆ لای دوکتۆر (وێژەیی).

بێ گومان لەمەپێش باشترە. هەندێ کەس لە کوردستانی باشووریدا ئەڵێن پێش ئیستا و ئەمەیش یان لە فەرهەنگی عەرەبیەوە وەریانگرتووە، یان داتاشراوە، یان ناوچەیی‌یە. هەروا کە پێشتر باسمان لێ کردووە ، لە موکریانیدا بە هەڵە لە جیاتیی لەمەپێش ، لەوەپێش بە کار ئەهێنرێت .

## پاشگری (یەتی) و (ایەتی) لە دوای ناوی واتایی و ...

یەکێکی تر لە هەڵەکان، بەکاربرانی نادروستی پاشگری (یەتی)یە کە لە دوای ناو دێت و زۆر جاریش پاشگری (ایەتی) دێت، وەک: برا (برایەتی) خزم (خزمایەتی) دۆست (دۆستایەتی) کورد (کوردایەتی) مەلا (مەلایەتی) پاشا (پاشایەتی) دراوسێ (دراوسێیەتی) کەس (کەسایەتی) هۆز (هۆزایەتی) کوێخا (کوێخایەتی) حیزب (حیزبایەتی) یەک (یەکیەتی) دووبەرەکە (دووبەرەکایەتی) سووک (سووکایەتی) زۆر (زۆرایەتی) کەم (کەمایەتی) ئازا (ئازایەتی) برسی (برسیەتی).

کەچی لە لایەن زۆر کەسەوە بە شێوەی ناوێژەیی ئەنووسرێن، وەک: یەکێتی، کەسێتی، دراوسێتی، سووکێتی ... هتد.

لە کاتی کۆبوونەوەکانی پارلمانی کوردستانی باشووریدا لە هەولێر لە ساڵی ٢٠٠٨دا کە ئەیانویست یاسای چەندژنی و چەند هاوسەری بۆ یاسای (احوال شخصیە) بنووسن، بۆ وەرگێڕانی وشەی شخصی لە زمانی عەرەبیەوە، وشەی کەسێتی ئەنووسرا و ئەمە زۆر هەڵەیە و ئەبووایێ کەسیەتی بنووسرایێ. من تەنیا

جارێک دیم که له سەر شاشەی تیلیویزیۆندا نووسرابوو کەسیەتی و ئیتر له هەمووی بەرنامەکاندا ئەیانوت و ئەیاننووسی کەسێتی. زۆر روونه که وەرگێڕاوی (شخصی) کەسیەتی‌یه، بەڵام ئێمه وشەی (کەسایەتی)مان هەیه که واتای شخصیت ئەدات و به ئینگلیسی پێی ئەڵێن Personality (پێرسۆنالیتی) و به فەڕانسەیی پێی ئەڵێن پێرسۆنالیتێ.

هەڵسەنگاندن:

| عەرەبی | فارسی | کوردیی هەڵە | ویژەیی و ستاندارد |
| --- | --- | --- | --- |
| جَوار – مجاورة | همسایگی | دراوسێتی | دراوسێیەتی |
| تآخی - أُخوَّت | برادری | براتی – برایی | برایەتی |
| شخصی | کسی – شخصی | کەسێتی | کەسیەتی |
| اتحاد | یگانگی | یەکێتی | یەکیەتی |
| جَوع | گرسنگی | برسێتی | برسی یەتی |
| کمێت | کمێت(هەر عەرەبیەکەی بەکارئەهێنرێت) | چەندێتی | چەندایەتی |
| کیفێت | کیفێت(هەر عەرەبیەکەی بەکارئەهێنرێت) | چۆنێتی | چۆنایەتی |
| اهمیت | اهمیت(هەر عەرەبیەکەی بەکارئەهێنرێت) | گرنگی | گرنگایەتی |

بێ گومان، یەکێ له هۆکارەکانی نووسین و خوێندنەوەی وشەو رسته و ئایدیۆم و ڕێزمانی هەڵه له بەرنامه تیلیویزیۆنه کوردیەکاندا، ناشارەزایی و نەزانی و کەم مایەیی یه. هۆکارێکی تری ئەم گیروگرفته، نەبوونی هەستی لێپرسراوەتی و بەرپرسایەتیی هەندێ کەسه و هۆکاری سێیەم، خزم خزمێنێ و بوونی پەیوەندی و رابطه بازی له کاتی دامەزرانی ئەو کەسانه له دام و دەزگا میریەکاندا، له جیاتیی

پێوەری یاسایی بووە. ئێستا لە کورستانی باشووری (لەعێراق)دا زەبرێکی هەرە گەورە لە بووار و رێباز وشێوە وەرگێڕانی زمانی کوردیدا لە فەرهەنگ و کولتووری کـوردی ئەدرێت. ژمارەییێکی زۆر لەو رستانە کە لە زمانە بێگانەکانەوە وەرگێرڕاونەتەوە سەر زمانی کوردی، بکەر و بەرکار و ئاوەڵناو و راناو و ئاوەڵکاری کات و جێگا و تێپەڕ و ... هتد، لە جێگای خۆیاندا بەکار ناهێنرێن و لە سەر فەرهەنگی عەرەبی و زمانەکانی‌تر وەریان ئەگێڕنەوە و ئەم کردەوەی ئەوان کاری کردووەتە سەر کوردەکانی کوردستانی ئێران و ئەوانیشی بەلای خۆیاندا راکێشاوە و زۆرجار تووشی چەوتی و لارەڕێیی ئەبن، چونکە ئەوان بێجگە لەمە کە دەیان ساڵە بەکوردی ئەخوێنن، ئێستا خۆیان بە خاوەنی سەربەخۆیی ئەزانن و بە ناوی سەمبول خۆیان ئەنوێنن و ئەبێ ئێمە وانە و زانیاری لەوانەوە فێرببین و هەر ئەبێ وایش بێ.

## چاوخشاندنێک بە سەر نموونەی هەڵەکاندا

شەوی ١٠/١/٢٠٠٩ لە سەر ١١/١/٢٠٠٩، تێلێویزیۆنی کوردستان لە بەشی هەواڵەکاندا کە لە لایەن ئەفسەرێکی پایەبەرزەوە بە ناوی عەمید (سەرتیپ) فەریدوون عومەرەوە بڵاوکرایەوە، چەندجار ئەفسەری ناوبراو وتی هات و چۆ، بەڵام ئەو ئەفسەرە لە شێوەی زمانەکەیەوە دیار بوو کە خەڵکی پارێزگەی سلێمانی بوو و هەولێری نەبوو، بەڵام بەهەڵە ئەیوت هاتووچۆ و لە سەر شاشەی تێلێویزیۆن بە پیتگەلی لاتین نووسرابوو:

Biwraî Hatuço

بەڵام ئەبووایێ بینووسایێ و بوترایێ:

بووڕای هات و چوو — Biwraî Hatûçû

دیارە کوردەکانی سلێمانی وەک زۆر کوردی تر، فەرهەنگی هەولێری کاری تێکردووون و بە تایبەت لە دوای هەڵبژێرانی هەولێر بە پێتەختی کوردستان، ئەم کارتێکرانە زەقتربووە.

لە بەشەکانی پێشوودا لە بارەی هەڵەبوونی هاتووچۆ (Hatûço)وە دوواوین و باسی کارتێکرانی شێوەی ستانداردمان کرد و لە بارەی شێوەکانی پارێزگەی هەولێرەوە شیکاریمان کردووە.

لە رێکەوتی ٢٩/١/٢٠٠٩ لە سەر ٣٠/١/٢٠٠٩ دا تێلێویزیۆنی کوردسات لە بەشی هەواڵەکاندا خوێندیەوە و لە سەر تەختایی(شاشە)ی تێلێویزیۆن نووسیبووی:

Giriftî hatûço

بەڵام پێویست و دروست بوو کە بینووسیایێ: Giriftî hatûçû

لە ڕێکەوتی ٢٤/١/٢٠٠٩دا تێلێویزیۆنی ڕۆژ (Roj.tv) نووسیبووی:

Rojanamewan---- serdanî Qendîl

بەڵام دروستەکەی ئەمە بوو:

Serdan le Qendîl

چونکە لە ڕستەی یەکەمدا واتاکەی ئەمەیە کە قەندیل بکەر بێت، بەڵام بەرکارە و پێویستیی بە پریپۆزیشنی (لە) هەیە.

هەروەها ئەو تێلێویزیۆنە لە ڕێکەوتی ناوبراودا لە بەشی سۆرانیدا وتی (گێریلاکانی تازە بەشدار بوو)، بەڵام ئەبووایێ بیوتایێ:

گێریلا تازە بەشداربووەکان.

ڕستەی یەکەم (ملکی)یە و ڕستەی دووەم بەیانی و گێڕانەوەیە.ئەو کەسە کە هەواڵەکەی ئەخوێندەوە، ژن بوو.

ڕۆژی ١٧/١/٢٠٠٩ کاتژمێر ٢ی نیوەڕۆ بە کاتی تاران تێلێویزیۆنی کوردسات لە بەشی هەواڵەکاندا لە بارەی وتوووێژ و لێک‌گەییشتنی لیڤنی تەزیمی (وەزیری دەرەوەی ئیسرائیل) و کاندۆلیزا رایس (وەزیری دەرەوەی ئەمریکا)وە کە نامەی لێک‌گەییشتنیان واژۆ کرد، وتی لێک تێگەییشتن.ئەویش ئەبووایێ بیوتایێ لێک گەییشتن، چونکە پیتی (ل) لە سەرەتای وشەی (لێک)دا واتای (تێ) ئەدات و پێویست ناکات دیسان بنووسرێتەوە.

له شەوی هەینی، ۲۱ نۆڤامبری ۲۰۰۸ له سەر ۲۲ نۆڤامبری ۲۰۰۸دا کوردسات له هەواڵەکانی خۆیدا له بارەی وەفد و کۆڕی نوێنەرایەتیی حوکوومەتی هەرێمی کوردستانەوە بۆ تورکیە، دوو جار وتی نێردراو (له جیاتیی نێرراو).

وتی: نێردراوی حکوومەتی هەرێمی کوردستان له شاری ئادانا. خوێنەری هەواڵ ناوی زانا بوو.

ڕۆژی هەینی، ڕێکەوتی ۱۹/۱۲/۲۰۰۸، تێلێویزیۆنی کوردسات له بەشی هەواڵەکاندا به پیتگەلی لاتین نووسیبووی:

Girtûxaney Gwantanamo

ئەبووایێ بینووسیایێ:

Girtûxaney Guantanamo

له ڕاستیدا ئەبێ بەم چەشنە بنووسرێت:

Girtûxaney Giwantanamo

چونکە له دوای پیتی بێ دەنگی G ، کورتە بزوێن یان بزرۆکەی (i) ئەنووسرێت و له زمانگەلی ئینگلیسی، عەرەبی و فارسیدا ئەم کورتە بزوێنە نیە و ئەگەر له زمانی فارسیدا دوو پیتی بێدەنگ له سەرەتای وشەدا بن، بێ گومان (کەسرە) یان ژێر ـــِـ که نزیک ئەبێتەوە بۆ پیتی (ێ)ی کوردی له نێوانیاندا ئەوترێت و به بێ ئەم ژێرە، دوو پیتی بێدەنگ له سەرەتاری وشەدا به یەکەوە نایێن و فارسەکان پیتی بزرۆکەیشیان نیە و ئەگەر وشەی وەک from له ئینگلیسیدا بخوێننەوە، ئەڵێن فِرام (فێرام) و ناتوانن بڵێن فرام. هەر بۆیە ئەگەر له سەرەتای وشەگەلی ئینگلیسیدا وەک Standard , speak , study , school و ... هتد دوو پیتی

بێ دەنگی وەک (st,sp,sc ...) ببێ، سەرەتا پیتی بزوێنی اِ (ئێ) ئەخوێننەوە، ئەمجار وشەکە ئەخوێننەوە و ئەڵێن: اِسکوول، اِستیودنت، اِستادی، اِسپیک، اِستاندارد. لەجیاتیی سکووڵ، ستیوودێنت، ستادی و ... و پیتی اِ(ئێ) زیادی یە.

لە ڕێکەوتی ٩/٢/٢٠٠٩ لە سەر ١٠/٢/٢٠٠٩ دا، تیلیڤیزیۆنی کوردسات کاتێ کە چەند کەس دەنگی لاوەگۆرانیبێژەکانیان تاقی ئەکردەوە، یەکێ لەو کەسانە کە دەنگی تاقی ئەکرایەوە و پێم وایە ناوی سیروان بوو، کاتێ گۆرانیی ئەوت، وشەی (چاو) لە گۆرانیەکەیدا بوو. یەکێ لە تاقیکارەکان وای ئەزانی کە ئەڵێ (ساو) چونکە بەڕاستی لەجیاتیی پیتی چ، پیتی (س)ی ئەوت و لام وایە ئەو کوڕە چکۆلە موکریانی بوو کە ئەیوت ساو و تاقیکارەکە لێی پرسی و وتی: ساو؟ دوایی زانیی و تێ گەییشت کە مەبەستی چاو بووە. ئەمە هەڵەیێکی فۆنێتیکی بوو (لە لایەن تاقی کراوەکەوە).

لە ڕێکەوتی ٩/٣/٢٠٠٩ لە سەر ١٠/٣/٢٠٠٩دا تێلێویزیۆنی ناوبراو کە بەرنامەی مێژووی چەنگیزخانی مۆغۆل (mongol)ی بڵاو ئەکردەوە، وێژەرەکە لەجیاتیی پیتی چ لە سەرەتای ناوی چەنگیزدا، بە شێوەی عەرەبی لەپەستا پیتی (ج)ی بەسەر زماندا ئەهێنا، واتە لە جیاتیی چەنگیزخان، ئەیوت جەنگیزخان و ئەمەیش یەکێ لە ئیقتدا و پەیڕەوییەکانە لە فەرهەنگی عەرەبی چونکە پێم وایە وتارەکە لە زمانی عەرەبیەوە وەرگێڕرابووەوە.

شەوی بەرواری ١٩/٣/٢٠٠٩ لە سەر ٢٠/٣/٢٠٠٩، هەر تێلێویزیۆنی کوردسات لە بارەی کوردەفەیلیەکانەوە (بەتایبەت لە بارەی کوردەکانی

مەندەلیەوە) لە سەرەتای دەستپێکرانی بەرنامەکەدا وتی: دژایەتی کردنی فەیلیەکان لەو دەڤەرەدا. بەڵام ئەبووایێ لە دواى (دژایەتی کردن) دا پرێپۆزیسیۆنی (لەگەڵ) بەکار بهێنرایێ چونکە ئەگەر بێتوو (لەگەڵ) بەکار نەهێنرێت، لە باری رێزمانەوە فەیلی یەکان ئەبنە بکەر و تاوانبار، بەڵام فەیلیەکان بەرکارن و حوکوومەتی بەعسی دژایەتیی لەگەڵ ئەواندا کردووە و بەعس بکەر و دژکار بووە. کەواتە، نووسەر و وەرگێڕەکان ئەبێ سەرنج بدەنە نووسراوە و وەرگێڕان و وتارەکانی خۆیان و بزانن ئامانج و واتای وشەو رستە و وتارەکەیان بەرەو کوێ ئەچێت و چی و کێ و کوێ ئەگرێتەوە.

شەوی بەرواری ٢/٤/٢٠٠٩ لە سەر ٣/٤/٢٠٠٩ تێلێویزیۆنی کوردسات لە بەشی هەواڵەکاندا بە پیتی لاتین ئاوای نووسیبوو

Rêzlênan le xwêndkar

کە دروستەکەی ئەمەیە:

Rêznan le xiwênkar

نیوەشەوی ٢٧/٣ لە سەر ٢٨/٣/٢٠٠٩، تێلێویزیۆنی کوردسات لە فیلمێکی جەنگی لەبارەی مۆگادیشۆی ئەفریقاوە، هەڵەی زۆری لە ژێرنووسی و وەرگێڕانی فیلمەکەدا هەبوو، بۆ نموونە، وشەگەلی دەبێت و ئەبێت زۆر بەرچاو ئەکەوتن کە ئەمانە واتای (میشود)ی فارسی وshould,must و ...ئینگلیسی ئەدەن و پیتی (ت) زیادی بوو و لە بەشەکانی پێشوودا باسمان لێ کردووە.

یان، نووسیبووی ئەبووایە، کە ئەبووایێ بیانووسیایێ (ئەبووایێ) واتە دوایین پیت، (ێ)یە نەک (ە). یان نووسیبوویان دەبێت بە ئاگا بێت، کە بێجگە لەمە کە پیتی

(ت) له وشەی (دەبێت)دا زیادی یە، وشـــەی بەئاگا هەڵەیە و ئەبووایێ تەنیا بنووسرایێ (ئاگا) یان (ئاگادار) بێت. باسی ئەمەیشمان کردووە...

هەروەها لەجیاتیی نایێ، نووسرابوو نایە!! له جیاتیی قەیناکا(ت) نووسرابوو قەیناکە. کار و کردەوەکە، سێەم کەسی تاقی بزرە واتە ئەو شتە قەی ناکا، ئیتر (ناکە) واتای نیە. ناکەم، ناکەی، ناکا ..... ئەوە دژی ڕێزمان نووسرابوو.

یان ئەفسەرێک بە توندی بریندار ببوو، رایسپارد کە "(بە کچەکانم بڵێ باش دەبم)". لێرەدا پاشگری (ەوە) له دوای دەبم نەنووسرابوو و له راستیدا ئەبووایێ بیانووسیایێ چاک دەبمەوە. رەنگە وەرگێڕەکە موکریانی یان خەڵکی ناوچەی هەولێر بووبێ. چونکە ئەو ئەفسەرە سەرەتا بۆ خۆی چاک بووە و بە هیوایە دیسان چاک ببێتەوە.(باش) واتایgood له ئینگلیسیدا و خوب له فارسیدا و یاخچی و ئی‌یی له تورکیدا ئەدات، بەڵام چاک بوونەوە واتای recover له ئینگلیسی و شفا له عەرەبیدا ئەدات. (وە) لێرەدا واتای (دیسان) و(دووبارە) ئەدات واتە ئەو کەسە سەرەتا بۆخۆی چاک و تەندوورست بووە، دوایی بریندار بووە دیسان چاک ئەبێتەوە.

له ڕێکەوتەکانی ١٧ ، ١٨ و ١٩ /٢٠٠٩/٧دا بەرنامەکانی کوردسات، کوردستان تی.ڤی. و زاگروس له بارەی پاڵاوتگەی (خورمۆڵە)وە، نووسیبوویان (پاڵاوگە) .

بەڵام ئەبووایێ بیانووسیایێ: (پاڵاوتگە) ، چونکە ئەبێ قەدی چاوگ بە کار بهێنین واتە له چاوگی پاڵاوتن، پاڵاوت (قەدی چاوگ) لەگەڵ (گە) بەکار بهێنرێت نەک

ڕەگی چاوگ. هەروەها وشەی ئەنگاوتن لە سەر کێشی پاڵاوتن.ئەتوانین بڵێین پاڵاوت ناوی کار و کردەوە (اسم الفعل) یا ناوی (چاوگ)ە .

لە شەوی ڕێکەوتی ١/٦/ لە سەر ١/٧ / ٢٠١٠دا کوردسات لە سەر تەختاییی شووشەی تێلێویزیۆندا بە پیتگەلی لاتین نووسیبووی :

Amarî hatuçoy 2009

کە ئەبی بەم پێیە ڕاست بکرێتەوە .

Amarî hatûçûy 2009

# ڕێکەوتن – ڕێک کەوتن – بە ڕێ کردن

بۆ زۆر کەس روونە کە سێ چاوگ و ئایدیۆمی ناوبراو، واتای جیاوازیان هەیە. لەزمانی عەرەبیدا چاوگی (ڕێک‌کەوتن) بریتی لە (توافق). لە ئینگلیسیدا پێی ئەڵێن Agreement یان To agree . هەروەها بۆ (ڕێکەوتن) لە زمانی عەرەبیدا ئەتوانین (عزیمت) ناو ببەین و لە ئینگلیسیدا ئەڵێن Departureیا To depart. یا set off یا set out. سەرەڕای ئەم دووجیاوازیە قووڵ و ئاشکرایەی ئەم دوو ئایدۆمە، زۆرکەس بە هەڵە لە جیاتیی یەکتر بەکاریان ئەهێنن. بێجگە لەم هەڵەیە، زۆرکەس لە جیاتیی ڕێکەوتن، پێشگری (بە)ی پێوە ئەلکێنن و ئەیکەن بە (بەڕێکەوتن) و ئەمەیش داتاشراوە و لە خۆوە دروستی ئەکەن. ئێمە لە کوردیی وێژەییدا (بەڕێکەوتن)مان نیە. تێلێویزیۆنی کوردسات، کاتی بەیانی، ڕێکەوتی ٢٥/١/٢٠٠٩ کاتێ کە کۆڕێکی کوردستانی عێراق کە دانا ئەحمەد پارێزگاری سلێمانی ڕەوانەی ئەکرد و بەرەو کرماشان ئەچوو، لە هەواڵەکانی خۆیدا وتی (ئەو کۆڕە بەرەو کرماشان بەڕێ کەوت)، بەڵام ئەبووایێ بینووسیایێ ڕێکەوت یا ڕێ کەوت. ئێمە ڕێکەوتنمان هەیە نەک بەڕێکەوتن. بۆچی هەندێ کەس بە ئارەزووی خۆیان وشە و چاوگ وئایدیۆم ئەگۆڕن؟!! ئێمە بەڕێکردنمان هەیە، واتە ڕەوانەکردن. بەڵام بەڕێکەوتنمان نیە. لە دوای نیوەڕۆی ڕۆژی ٤/دیسامبر/٢٠٠٨ دا لە تێلێویزیۆنی Kurdistan T.Vدا کە لە بارەی مێژووی گەرمیان و کەرکووکەوە بەرنامە بڵاو ئەکرایەوە، وێژەرەکە دووجار وتی گۆڕدراوە (لە جیاتیی گۆڕاوە)، کە پێموایە وێژەری بەرنامە موکریانی بوو.

له ڕێکەوتی ١٣/١٢/٢٠٠٨ له سەر ١٤/١٢/٢٠٠٨ دا تیلیویزیۆنی کوردسات له هەواڵێکدا له بارەی (گەیتس)ی وەزیری بەرگریی ئەمریکاوه له ڕستەییێکدا له جیاتیی تواناییی ئەوەی هەبێ، وتی تواناى ئەوەی هەبێ.

هەروەها نووسیبووی:

Rêzlênan le şehîd

که ئەبووایێ بینوسیایێ:

Rêznan le şehîd

شەوی ٧/١٢/٢٠٠٨ هەر تیلیویزیۆنی ناوبراو له هەواڵەکاندا له سەر تەختایییی شووشەکه نووسیبووی:

Amadekarî Bo Rêkxistinî hatûço

که دروستەکەی ئەمەیه:

Amadekarî Bo Rêkxistinî hatûçû

---

ڕۆژی هەینی ڕێکەوتی ١٣/٢/٢٠٠٩ کاتژمێر ٢ی دوای نیوەڕۆ به کاتی تاران، تیلیویزیۆنی Kurdistan T.V له هەواڵەکانی خۆیدا نووسیبووی و وتی:

قەرەبووکرنەوەی زیانلێکەوتووەکان

بەڵام ئەبووایێ بینووسیایێ:

قەرەبووکردنەوەی زیانی خەڵکی زیانلێکەوتوو.

---

شەوی ١٣/٢ لە سەر ١٤/٢/٢٠٠٩، تێلیویزیۆنی کوردسات چەندجار لە هەواڵەکانی خۆیدا وتی هێزەکانی فرەنەتەوە کە دروستەکەی (هێزە-فرەنەتەوەکان) بوو.

هەروەها شەوی ١٤ لە سەر ١٥/٢/٢٠٠٩ هەر تێلیویزیۆنی کوردسات چەند جار لە بەشی هەواڵەکاندا لە بارەی هاتنی هێزەکانی ئەمریکاوە بۆ کەرکووک وتی هێزەکانی فرەنەتەوە کە دروستەکەی (هێزەفرەنەتەوەکان)بوو. لە ڕێکەوتی شەوی ١٨/٢/٢٠٠٩ لە سەر ١٩/٢/٢٠٠٩ دا کوردستان لە بەشی هەواڵەکاندا لە سەر شاشەی تێلیویزیۆن بە پیتی لاتین نووسیبووی:

Têkelbûni awî xwardinewe û awero

کە دروستەکەی ئەمەیە:

Têkellbûni awî xiwardinewe w awerro

شەوی ٢٢/٢ لە سەر ٢٣/٢/٢٠٠٩ تێلیویزیۆنی Kurdistan T.V لە بەشی هەواڵەکاندا لە بارەی هەڵەبجەوە نووسیبووی:

Helebce u Awedankirdinewe

کە دروستەکەی ئەمەیە:

Hellebce w Awedankirdinewe

شەوی ٢٣/٢/٢٠٠٩ لە سەر ٢٤/٢/٢٠٠٩ کوردسات لە بەرنامەی خۆیدا لە بارەی وڵاتی (بڕیزیل)ەوە وشەی (Indians)ی بە هێندی وەرگێڕابووەوە، بەڵام

هەروا کە لە بەشەکانی رابووردوودا باسمانکرد، لە ئینگلیسیدا وشەی Indians

واتای سوورپێستەکانی هەیە نەک هیندیەکان.

شەوی ٢٨/٢ لە سەر ٢٩/٢/٢٠٠٩ کوردسات تی .ڤی لە بەشی هەواڵەکاندا لە

کاتی دیداری جەلال تاڵەبانی لە تاران، (وێژەری ژن) وتی بە توانا و کارا کە

دروستەکەی (توانا و کارا)یە و پێشگری (ب) زیادی‌یە.

لە رێکەوتی ٩/٢/٢٠٠٩ لە سەر ١٠/٢/٢٠٠٩ دا، تێلێویزیۆنی کوردستان لە

هەواڵەکاندا لە سەرتەختایی‌ی شووشە تێلێویزیۆندا نووسیبووی:

Rêzlenanî pêşmerge

ئەمە واتای ئەوە ئەدات کە پێشمەرگە رێزی لە کەسێک نابێت و پێشمەرگە بکەر

بێت، بەڵام دیارە پێشمەرگە لێرەدا بەرکارە و ئەبووایێ بنووسرایێ:

Rêznan le pêşmerge

واتە لێرەدا پرێپۆزیسیۆن پێویستە.

دیارە لە هەندێ زماندا، بۆ نموونە لە ئینگلیسیدا لە دوای وشەی رێز واتە

(respect) پرێپۆزیسیۆن نایێت و نانووسرێت، وەک:

We must respect our parents

ئێمە ئەبێ رێز لە دایک و باوکمان بنێین.

شەوی ٢٦/٣/٢٠٠٩ لە سەر ٢٧/٣/٢٠٠٩ تێلێویزیۆنی کوردستان تی.ڤی لە

بەرنامەی (هەواڵ و پانۆڕاما)دا لە بارەی بارودۆخی هاتووچوو واتە (مرور)ەوە زیاتر

لە دە جار وتی هاتووچۆ و لە سەر تەختایی و شاشە نووسیبووی، بەڵام دیارە

دروستی ئەوە (هات و چوو)ە.

له ڕێکه وتی ۲۳ له سه ر ۲٤ / ۸ /۲۰۰۹ دا کوردسات له به شی هه وا ڵه کاندا

به پیتگه لی لاتین له سه ر ته ختاییی شووشه ی تێلێڤیزیۆندا نووسیبووی

qerebûkirdnewey 232 xêzanî qelay nizarkê

که ئاوا ڕاست ئه کرێته وه :

qerebûkirdinewey zîanekanî 232 xêzanî qelay nizarkê

له ڕێکه وتی ۲۲ له سه ر ۲۳ / ۸ /۲۰۰۹ دا کوردستان. تی ڤی به ده م و به

نوسراوه له سه ر ته ختاییی شووشه ی تێلێڤیزیۆندا ڕای گه یاند :

تاران ڕێگەی‌دا پشکێنەرانی ئەتۆمی سەردانی بنکە ئەتۆمیەکانی ئێران بکەن.

که ئاوا ڕاست ئەکرێتەوە :

تاران ڕێگەی دا پشکنەرانی ئەتۆمی سەردانی بنکە ئەتۆمیەکانی ئێران بکەن.

## بەکار نەبرانی شێوەی زمانی یەکگرتوو لە کۆبوونەوە فۆڕمیەکاندا

ئەگەر سەرنجێک بدەینە وڵاتی ئێران و زمانی فارسی، بۆمان دەر ئەکەوێت کە زمانی ناوبراو خاوەنی چەند شێوە و زاراوەی جۆربەجۆرە، وەک شێوەگەلی تارانی، ئیسفەهانی، شیرازی، خۆراسانی و ... هتد. بەڵام ئەگەر کۆبوونەوەیێکی فۆڕمی لە پارلمان یان لە وەزارەتخانە و رێکخراوێکی حوکوومەتیدا پێک بێت، ئەگەر هەرکام لە ئەندامانی پارلمان یا هەرکام لە بەشداران لە کۆڕ و بەراڤی و کۆبوونەوەکاندا خەڵکی شار و ناوچە و هەرێمێکی جیاواز بن و خاوەن زاراوە و شێوەی جۆربەجۆر بن، بەڵام سەرەڕای ئەمە، لە کۆبوونەوەکاندا بەشێوەی فۆڕمی ئەدوێن و ئاخاوتن ئەکەن و ئیتر هەرکەس بە شێوەی ناوچەی خۆی قسە ناکات. بەڵام لە پارلمانی کوردستانی باشووری (عێراق)دا زۆرکەس بە شێوەی نافۆڕمی و ناوێژەیی و بە شێوەی خۆیان قسە ئەکەن و ئەدوێن و دەست ئەکەن بە دەبیتن و دەچیتن و لۆ لۆ (بۆ) لە جیاتیی هەستی لێ پرسراوەتی و بەکارهێنانی شێوەی فۆڕمی، شێوەزمانی خۆیان بەکار ئەهێنن. لە هاوینی ساڵی ۲۰۰۸ دا چەند کەس لە تیلیویزیۆنی کوردساتدا لە سەر زمانی فۆڕمی و وێژەیی قسەیان ئەکرد، پێموایە یەکێکیان دوکتۆر رەفیق بوو کە ئاماژەی کرد بۆ دووان و قسەکردنی هەندێ کەس کە هەر بە شێوەی خۆیان، دەبیتن و دەچیتن و نابیتن ... هتد بە کار ئەهێنن و رەخنەی لەو کەسانە گرت کە لە ئامێر و دەزگا و نووسراوە فۆڕمیەکاندا بە هۆی ناوچەپەرستیەوە، وشە وشێوەی فۆڕمی و ستاندارد و وێژەیی بە کار ناهێنن. بەڵام

سەرەڕای ئەو لێدووان و وت ویێژە و زۆر بەرنامەی تر لەم بارانەوە، هیشتا بەرپرسەکان لە کۆڕ و بەراڤیەکاندا گوێ نادەنە ئەم تەوەر و بابەت و چەمک و باسانە و کەمتەرخەمن.هەروا کە لە بەشەکانی پێشوودا باسمان لێکرد، یەکێ لەو چاوگ و وشانە کە بە هۆی ناشارەزایی و کەمتەرخەمیی زۆر کەس لە نووسەر و وێژەرەکانی میدیا و تێلێویزیۆنە کوردییەکانەوە بەهەڵە بڵاو ئەکرێتەوە، وشەی (گواستنەوە)یە کە لەجیاتیی وشەی (گوێزانەوە) بە کاری ئەهێنن. تەنانەت لە زۆربەی پەرتووک و نووسراوە ڕێزمانیەکاندا، بۆ انتقال و منقول و ئەم چەشنە وشە و چاوگە عەرەبیانە، گوێزانەوە و گوێزراوە و گوێزرانەوە بە کار براوە، بەڵام ئەمڕۆ بە هۆی زاڵ بوونی شێوەی هەولێری و موکریانی و پەرەسەندنی دەسەڵاتی مرۆڤی لە ناو بەرنامە تێلێویزیۆنی و چاپەمەنیەکاندا، چاوگی گوێزانەوە و بەرکاری نادیاری گوێزراوە و گوێزرانەوە ئاخنراونەتە قوژبنی فەرامۆشی و لە بیر بردنەوە و چاوگی گواستنەوە بەکار دێت و بۆ نادیار و بەرکار، گوازراوە بەکار دێت و تارادەییێک پانهەولێریزم و پانموکریانیزم لە لایەن هەندێ کەسەوە بەسەر شێوەی وێژەییدا زاڵ بووە و ئەم فەرهەنگە وەک نەخۆشییێکی ئێپیدێمیک و درم و ئاهۆ و پەتا لە پارێزگەی سلێمانی، ناوچەکانی بابان و گەرمیان و تەنانەت لە کوردستانی ئێراندا پەرەی سەندووە و وەک زۆر وشەی تر وشەی (بێجگە) کە بووە بە (جگە)، لە بیر ئەبرێتەوە وشەی (بەجێماو) کراوەتە (جێ ماو) و تەنانەت وشەی (لەبیرچوونەوە) کراوە بە (بیرچوونەوە) کە شێوەی ئەردەڵان و گەرمیانە نەک ستاندارد و وێژەیی.

## بەم زووانە ، پەیوەندی، پیشاندان ، ئامرازی کۆ

وشه و ئایدیۆمی بەم زووانە زورتر واتای (اخيراً) له زمانی عەرەبیدا ئەگەیێنێ و له ئینگلیسیدا پێی ئەڵێن:Recently(ریسێنتلی).بەڵام وێژەر و نووسەرەکانی سەر رادیۆ و تیلیویزیۆن بۆ واتا و ئایدیۆمی (زوو بە زوو) یان ( بەزوویی) بە کاری ئەهێنن. بەم زووانە بۆ رابووردوو ئەبێت، بەڵام ئەوان هەر بۆ داهاتوو واتە له جێگای واتای soon بەکاری ئەهێنن؛ واتە وشەی (Recently) یان کردووە بە (soon) و ئەمە خەیانەت و نادۆستایەتیە بەرانبەر بە زمانی کوردی و فەرهەنگ و مافی نەتەوەی کورد. ئەوان بۆ داهاتوو، له جیاتیی بەم زووانە، ئەتوانن بنووسن زووبەزوو یا بەزوویی نەک سەلیقە و بۆ چوونی خۆیان بەکار بهێنن. ئەم ئایدیۆم و ئاوەڵکارەیش خەریکە ئەکرێتە سەرانسەری و هەموو لایەنە و وەک ئاهۆ و درم، گشت لایێک ئەتەنێتەوە و ئێپیدێمیکە.

یەکێکی تر لەو وشانە کە هەندێ کەس بەتایەبەت له ناوچەکانی موکریان و هەولێردا بە سەلیقەی خۆیان ئاڵوگۆڕیان بەسەردا هێناوە، وشەی (پەیوەندی)یە کە ئەنووسن پێوەندی. ئایا ئەم یەک بان و دوو هەوایە واتای چی ئەدات ؟ له بەر چی ئەبێ بە دوو جۆر بنووسرێت؟ مەگەر له هەر ناوچەیێکدا ئەبێ بەچەشنێک بنووسرێت؟ هەرکامیان دروستە، ئەبێ ئەوە بنووسرێت. یان وشەی (پیشاندان) کە له زۆربەی ناوچەکانی گشتی کوردستاندا کراوە بە (نیشاندان). ئەم وشەیە تا ٢٠ ساڵ لەمەپێش هەر (پیشاندان) بوو، بەڵام ئەو کەسانە کە له بەرنامەگەلی رادیۆ و تیلیویزیۆنەکاندا بەرنامە ئەنووسن و بڵاو ئەکەنەوە، کردوویانە بە (نیشاندان).

وشەی پیشاندان لە دوو بەشی پێ + نیشاندان پێک هاتووە بەڵام سەلیقەکار و ناشارەزا و دوور لە لێپرسراوەتیەکان پێشگری (پێ)یان لابردووە و تەنیا نیشاندانیان هێشتووەتەوە کە ویژەیی نیە و لە شێوەگەلی ئەردەڵان و گەرمیان و ... هتد وەرگیراوە و لە راستەقینەدا رەسەن و ستاندارد نیە. نیشان هەر (نشان) لە زمانی فارسیدایە. بەڵام لە کوردیدا پێشگری(پێ)ی هەیە.

## کۆی کۆ

هەڵەییێکی تری کەسانی بەهەڵەداچوو، ئەوەیە کە زۆرجار ئەگەر (کۆ)ی وشە و بابەت و تەوەرێک بەکار بهێنن، (کۆی کۆ) واتە (جمع الجمع) بەکار ئەهێنن. بۆ وێنە ئەڵێن مەوادەکان. دیارە (مەواد) بۆخۆی کۆی ماددەیە. بەڵام (کان) نیشانەی کۆی ناسراو یا ناسراوی (کۆ) یە. مەوادەکان واتە مادەکان کان. وەک ئەمە وایە کە دووجار (کان) بەکار هێنرابێت.

یان ئەڵێن ئەشیاکان، لەوازمەکان، مەداریکەکان. جاخۆ اشیاء، لوازم، مدارک لە عەرەبیدا کۆی (شیء، لازمە و مەدرەک)ن. یان ئەڵێن قواتەکان. قوات خۆی کۆی (قوة)ە.

یان ئەسنـــــادەکـــان!! ئەمانە هەڵـــــەگەلـــــی زۆر زەق و ناشیـــــرینن. ئەو کەسە بەهەڵەداچووانە یان ئەبێ بڵێن ئەشیا، لەوازم، مەدارک، قوات، مەواد، یان ئەبێ بڵێن مەدرەکەکان، لازمەکان، قووەتەکان، ماددەکان ... هتد. ئیتر

ناشیرینه له سەر تەختایی‌ی شووشەی تێلێویزیۆندا بەهەڵە بیانخوێننەوە و خەڵکی تریش تووشی هەڵە و لارەڕێیی بکەن.

## قسه و دووانی ناشیرین به شێوەی زمانگیراو

زۆرکەس له کوردستانی باشووری (عێراق)دا کاتێ قسه ئەکەن و بەتایەبەت له کاتی لێدووان و وتو وێژ و شیکاری و لێکۆلینەوه و دەربڕینی بیروڕای رامیاری و ئەم چەشنه بابەت و تەوەرانەدا، چەند جار پرێپۆزیسیۆنەکان وەک (له، بۆ، تێ، پێ، به) دووباره ئەکەنەوه و ئەیانڵێنەوه و بۆ وێنه ئەگەر بڵێن له باری ئابووری یەوە، سەرەتا لەپەستا و بێ وچان چەندجار ئەڵێن له له له له ... ئەمجار وشەی ئابووری به سەر زماندا ئەهێنن و یان ئەگەر بڵێن پێم وایه، چەندجار ئەڵێن پێم، پێم ، پێم .... جارێک کەسێک له سەر یەکێ له کاناڵه کوردی یەکانی کوردستانی باشووریدا قسەی ئەکرد، ٧ جار وتی له ... و ئەمه زۆر ناشیرینه. کوردەکانی ئێران و باکوور ئەم هەڵەیان نیه و ئەگەر ئاسەواری کارتێکردنی زمانی عەرەبی یه، ئەبێ کارێک بکەن له فەرهەنگ و زمانی خۆیاندا لای ببەن. من هەندێ کەسم بینیوه که لەسەر شاشەی تێلێویزیۆندا به کوردی بۆ ماوەی یەک سەعات دوواون، بەڵام ئەو کەسانه به دەگمەن یا کەمتر تووشی ئەم هەڵەیه بووون، وەک بەڕێز فەلەکەددین کاکەیی، وەزیری پێشووی فەرهەنگ و رووناکبیری. بەڵام زۆرکەس بەڕاستی ناشیرین قسه ئەکەن و ئەگەر کەسێکی هەندەرانی و ناشارەزا گوێی له قسەکانیان بێ، وا ئەزانێت ئەوانه زمانیان ئەیگرێت، چونکه ئەم چەشنه قسەکردنه له فەرهەنگی کوردەواری

و کوردیدا نیه. بەڕێز فەلەکەددین کاکەیی زۆر رەوان و بێ کەند و کۆسپ قسە ئەکات و زۆر بەڕێکەوت دووبارەکردنەوەی پیت و وچان لە قسەکانیدا ئەبیسرێت، کەچی زۆر بەرپسیارو لێپرسراوی تر هەن کە بەڕاستی بە دووبارە کردنەوەی لە، بۆ، پێ ، بە ... وتار و قسەکانی خۆیان لە بەرچاوی بینەر و گوێگرەکاندا ئەخەن، چونکە ئەمە لەگەڵ فەرهەنگی کوردیدا ناتەبایی و ناهاوئاهەنگی و ناکۆکیی هەیە. ئەگەر کەسێکی ئورووپایی یا خەڵکی هەر وڵاتێکی دەرەکی و هەندەران گوێی لەم چەشنە لێدووان و دووبارەکرانەوانە بێت، وا تێ ئەگات کە ئەو کەسە کە وا قسە ئەکات، زمانی ئەیگرێت یان زمانی کوردی هەر وایە!!

## گۆڕانی هەندێ وشە لە ئاکامی ناوچە پەرستی یا ناشارەزاییدا

لە یەکێ لە بەشەکانی پێشوودا، لە سەر ئەوە رۆیشتین کە هەندێ وشەی رەسەن و پەتی و ویژەیی وەک (بێجگە) و (بەجێ هێشتن) لە بیر براونەتەوە و وشەگەلی جگە و (جێهێشتن) بە کار ئەبرێن واتە دوو پێشگری (بە – بێ) لابراون و ئەم دوو پێشگرە کە لە بانە و هەندێ شار و گوندی موکریاندا بە کار ئەهێنرێن، لە قوژبنی فەرامۆشیدا ئاخنراون و شێوەی ئەردەڵان و بابان بۆ ئەوانە بەکار ئەهێنرێت.

ئەو کەسانە زۆر وشەی تریشیان بە شێوەی ناوچە و هەرێمەکەی خۆیان نووسیوە و سەلیقە و تێگەییشتن و شێوەی ناوچەی خۆیان بە کار ئەهێنن و یەکێ لەو وشانە، (جێژن)ە کە (جەژن) بە کار ئەهێنن. لە گشت شارەکانی پارێزگەی کوردستانی ئێراندا، هەر لە بانەوە بگرە هەتا ئەردەڵان و موکریان و تەنانەت لە بادینانی کوردستانی عێراق وەک شارەکانی زاخۆ، دهۆک، ئامێدی، ئاکرێ، شێخان، بارزان و .... هتد و لە کوردستانی باکووریدا لە تورکیە و لە کوردستانی رۆژئاوادا لە سووریە و لە ناو کوردەکانی ئەرمەنستان، ئازرەبایجانی باکوو، قەرەباخ، گورجستان، قەزاقستان، تورکمەنستان، ئۆردۆن، لوبنان، خۆراسانی ئێران ... هتد، هەمووی کوردەکان ئەڵێن (جێژن – cêjin). مامۆستا پیرەمێردیش کە خەڵکی سلێمانی‌یە لە هۆنراوەکەی خۆیدا هەر (جێژن)ی نووسیوە و خوالێخۆشبوو حەسەن زیرەکیش لە سروودەکەی خۆیدا لە بارەی نەورۆزەوە ئاوا هۆنراوەکەی پیرەمێرد کە مامۆستا سالح دیلان ئاواز و هەواکەی داناوە، ئەخوێنێتەوە:

←

ئەمڕۆژی، ساڵی تازەیە، نەورۆزە، هاتەوە

جێژنێکی کۆنی کوردە، بە خۆشی و بە هاتەوە

بەڵام لە تێلێویزیۆنەکانی کوردستانی عێراقدا کە بەرەو کوردستانی ئێرانیش پەرەی سەندووە، لە جیاتیی جێژن، ئەنووسن جەژن و هەر جەژن ئەخوێننەوە.

نەهات و نەهات ، دڵ ماتەن ئەمشەو / ئەڵبەت جێژنەکەی بەراتەن ئەمشەو (مەولەوی)

هێڵکاری و هەڵسەنگاندن:

| بانە و زۆربەی کوردەکانی جیهان | بەشێ لە سلێمانی و هەندێ لە هەورامیەکان (بەشێ لەناوچەی بابان) |
|---|---|
| جێژن Cêjin | جەژن Cejin |

ئەتوانین بڵێین گشت کوردەکانی باکوور، کوردەکانی موکریانی ئێران، ئەردەڵانی ئێران، زۆربەی کوردە سۆرانیەکان لە شێوەی کرمانجیی خواروو و لە باشووری کوردستانی عێراقدا، ئەڵێن جێژن، بەڵام لە سلێمانی و لە نووسراوەکانی زۆربەی کوردەکانی عێراقدا جەژن بە کار ئەهێنن. تەنانەت بۆ کوردەکانی باکووری هەولێرو مووسڵ گۆڕاوە و وشەی جێژن لە هۆنراوەی پیرەمێردا و لە سروودی حەسەن زیرەکدا گۆڕاوە و کراوە بە جەژن و ئەمە دوور لە وێژە و رسەنایەتی و داد و کوردایەتی و ستانداردخوازی و یەکگرتوویی خوازی یە وتەنیا هەستی سەپاندنی ناوچەپەرستی و نیشانەی کەمتەرخەمی و ناشارەزایی یە.

شایانی سەرنجە کە وشەی جەژن کە لە هەورامیەوە هاتووە، لە بنەڕەتدا بریتی لە(جەشن)ە و جەشن فارسی یە، کەواتە جێژن باشترە.لە سلێمانی و بابان تەنانەت بە«کارگ » و«کەنگر» ئەڵێن « قارچک» و« قنر» کە شێوەی ئەردەڵانن.

# هه بوون — بوون

ژماره‌یێکی زۆر له نووسه‌ران، وه‌رگێڕه‌کان و وێژه‌ره‌کان ئه‌م دوو چاوگه له‌جیاتیی یه‌کتر به‌کار ئه‌هێنن، به‌ڵام هه‌روا که ئه‌زانین، ئه‌مانه دوو واتای فره جیاوازیان هه‌یه.

دیاره (هه‌بوون) له زمانی ئینگلیسیدا پێی ئه‌وترێت To have و له فه‌ڕانسه‌ییدا ئه‌ڵێن Avoir و له فارسێدا پێی ئه‌ڵێن (داشتن) و له تورکیدا ئه‌ڵێن وارماغ (ڤارماغ) و له ئیتالیاییدا ئه‌ڵێن avere (ئه‌ڤێرێ) وه‌ک:

زمانی کوردی پێنج زاراوه‌ی جۆر به جۆری هه‌یه.

Kurdish language has 5 different dialects.

به‌ڵام چاوگی (بوون) له ئینگلیسیدا پێی ئه‌ڵێن To be و له فارسیدا ئه‌ڵێن بودن و له فه‌رانسه‌ییدا ئه‌ڵێن Être و له ئیتالیاییدا ئه‌ڵێن Essere ، وه‌ک:

سۆرانی زاراوه‌یێکی کوردی‌یه.

Sorani is a Kurdish dialect

شا، به‌کرێ‌گیراوێکی ئه‌مریکا بوو.

Shah was a mercenary of America.

بۆمان ده‌رکه‌وت که (هه‌بوون) و (بوون) دوو چاوگی جیاوازن که خاوه‌نی واتای تایه‌به‌تی خۆیانن. گه‌لێ جاران بیستوومانه که بۆ وێنه هه‌ندێ که‌س ئه‌ڵێن به‌هۆی هه‌بوونی شڵێوه و له‌نگێزه‌وه، به هۆی هه‌بوونی سه‌رما و سۆڵه‌وه، له‌به‌ر هه‌بوونی شه‌ڕ و ئاژاوه‌ی ناوخۆ، که چاوگی (هه‌بوون) به هه‌ڵه له باتیی (بوون) به کار هێنراوه، یان به پێچه‌وانه له جیاتیی هه‌بوون، (بوون) به کار ئه‌هێنرێت.

## بەربەرەکانێ – بەرگری

فرەجار ئەم دوو ئایدیۆمە لە جیاتیی یەکتر بە کار ئەهێنرێن و هەندێ کەس بەتایبەت لە ئێراندا وا ئەزانن کە هەردووکیان یەک واتایان هەیە، بەڵام بەربەرەکانێ واتای مقابلە و مقاومت ئەدات و بەرگری واتە دفاع (deffence).

لەدوای (بەربەرەکانێ)دا پریپۆزیسیۆنی (لەگەڵ) بە کار ئەهێنرێت وەک: بەربەرەکانێ لەگەڵ نەخوێندەواریدا، بەربەرەکانێ لەگەڵ دوژمندا. لە دوای بەرکار ئەبێ پاشگری (دا) بە کار بهێنرێت.

لە دوای بەرگری، پرپپۆزیسیۆنی (لە) دێت، وەک: بەرگری لە نیشتمان، بەرگری لە مافی گەل.

لە وەرزی زستانی ساڵی **١٣٨٧** (**٢٠٠٩**) دا ئیدارەی تۆڕی تەندروستی و دەرمان لە شاری بانە بۆ بانگەشەو پڕۆپاگاندە لە پێناوی پێشگری و نەهێشتنی نەخۆشیی ئەیدز (H.I.V-aids)، لە شەقامەکاندا (بۆ وێنە لە سەر کۆڵانی پاڵ ئیدارەی کارەبادا لە سەر کووتاڵێکی سپیی گەورەدا نووسیبووی ): بۆ بەرگری لە ئەیدز!!

ئەمە زۆر هەڵە بوو چونکە ئەگەر بەرگری لە ئەیدز بکرێت واتە (دفاع)مان لێکردووە.

دروستەکەی ئەوە بوو کە بنووسرایێ:

بۆ بەربەرەکانێ لەگەڵ ئەیدزدا واتە بۆ (مقابلە) و (مبارزە) و دژایەتی لەگەڵ ئەیدزدا و بۆ بەرەنگاربوونەوەی و بۆ بەرگری لە گیانی خەڵک لە بەرانبەر ئەو نەخۆشیەدا.

## چارەسەر ـ بەڵێن

دوو وشەی ناوبراو لە باری ڕێزمانەوە پێیان ئەڵێن ناوی چاوگ واتە اسم المصدر و ناو،(لە زمانی ئینگلیسیدا ئەڵێن verbal noun (ناوی کردەوە) یان Gerand یان action noun. هەندێ کەس لە کوردستانی باشووریدا بەتایبەت لە پارێزگەی هەولێر و موکریاندا ئەنووسن چارەسەری، بەڵێنی. ئەو چەشنە کەسانە وا تێ ئەگەن کە ئەگەر پیتی (ی) بەو وشانەوە بلکێنرێت، ئەبنە ناو یا ناوی چاوگ، بەڵام جاخۆ ئەوانە بۆخۆیان ناوی واتا و ناوی چاوگن و چاوگەکانیان بریتین لە چارەسەکردن و بەڵێن دان. بەڵێن واتە قَول و وَعد (لە زمانی عەرەبیدا) و لە زمانی ئینگلیسیدا پێی ئەوترێت Promise . چارەسەر لە زمانی ئینگلیسیدا واتە remedy (To make a remedy)یان solution (to solve). لە عەرەبیدا پێی ئەڵێن (حل) و (علاج) یان معالجە.ئەمانە پێویستییان بە پیتی (ی) نیە و ئەگەر ئەم پیتەیان پێوە بلکێنرێت، هەڵە و نادروست ئەبن.

## وشەی باڵندە!! واتە (پەلەوەر)

وشەی باڵندە داتاشراوێکی ناوێژەیی و دوور لە زانیاری یە و لە دوو بەشی (باڵ) و(ندە) پێک و بەدی هاتووە.

گەرچی وشەی باڵ کوردی یە، بەڵام پاشگری (ندە) لە زمانی فارسی یەوە وەرگیراوە و نیشانەی بکەرە و لە زمانی فارسیدا زۆرتر لە دوای ئاوەڵناوی بکەری دارێژراو یا لێکدراوی قرتاو واتە (صفت فاعلی مرکب مرّخم) دێت، وەک ئەم هێڵکاری یە:

| ئاوەڵناوی بکەری لێکدارو و دارێژراوی قرتاو | ئاوەڵناوی بکەری لێکدراو و دارێژراوی نەقرتاو | واتای کوردی |
|---|---|---|
| | لێکدراو | |
| دانش آموز<br>یاری رسان<br>التیام بخش<br>میهن فروش<br>واپس گرا<br>کتک زن<br>روبوس<br>جانباز<br>نان آور | دانش آموزندە<br>یاری رسانندە<br>التیام بخشندە<br>میهن فروشندە<br>واپس گرایندە<br>کتک زنندە<br>روبوسندە<br>جانبازندە<br>نان آورندە | فێریار – قوتابی<br>یارمەتی دەر<br>سارێژکەر<br>نیشتمان فرۆش<br>کۆنەپەرست<br>لێدەر<br>رووماچکەر<br>خۆبەختکەر<br>نانهێنەر |
| | دارێژراو | |
| نشین<br>پاش<br>شِنَو | نشینندە<br>پاشندە<br>شنوندە | دانیشەر<br>پرژێنەر<br>بیسەر |

ئەمەیش نموونەی ئاوەڵناوی بکەری سادەی دانەڕێژراو یان لێک نەدراوی نەقرتاو

| چاوگی فارسی | ئاوەڵناوی بکەری سادەی نەقرتاو | ئاوەڵناوی بکەری لێکدراو یان داڕێژراوی قرتاو | واتای کوردی |
|---|---|---|---|
| آوردن | آورنده | (خنده آور) نده | (پێکەنین هێن)ەر |
| ربودن | رباينده | (دلربای)نده | (دلڕفێن)ەر |
| نواختن | نوازنده | (نواز) نده | ( ژەن) ەر |
| چراندن | چراننده | (گاوچران) نده | (گا لەوەڕێن) ەر |
| دوختن | دوزنده | (پيراهن دوز) نده | (کراس دروو) ەر |
| جوشيدن | جوشنده | (جوش آور) نده | (کوڵهێن)ەر |
| بوسيدن | بوسنده | (روبوس) نده | (رووماچکەر) ەر |
| راندن | راننده | (ارابه ران) نده | (داشقەلێخوڕ) ەر |
| نوشتن | نويسنده | (نويس) نده | (نووس)ەر |

که واته، (نده) له فارسیدا نیشانه و ئامرازی بکەری (فاعلی)یه و پێویست ناکات ئەم وشه داتاشراوە بەکار بهێنن چونکه ئێمه وشەی کوردیی پەتی و وێژەیی وەک (پەلەوەر) مان هەیه و ئەبێ له جیاتیی باڵندە، پەلەوەر بە کار بهێنن و تەنانەت وشه و ئاوەڵناوگەلێک وەک دڕندە، شەرمەندە و بەخشەندە، فارسین. دیاره زمانگەلی فارسی و کوردی لە یەک ریشەن و وەکوو ئیدرۆژن و ئۆکسیژنن که پێکهاتووەکەیان (ئاو)ە، بەڵام لە کاتێکدا که ئێمه وشەی رەسەن و پەتی و سەرەبەخۆی پەلەوەرمان هەیه، بۆچی ئەبێ لە وشەی داتاشراوی هەڵەی باڵندە کەڵک وەرگرین؟ ئەگەر بۆ کێشی هۆنراوە و قافیه و ئەم چەشنه بابەت و تەوەرانه باڵندە بەکار بهێنن ، رەنگه قەید نەکات، بەڵام کاتێ که زۆرەملیمان لێ نەکراوە،

بۆچی ئەبێ بە کاری بهێنین؟ وەک ئەمە وایە کە ئێمە لە جیاتیی (لێبووروەر) یان (لێبووردوو)،بەخشەندە بە کار بهێنین و لە جیاتیی شەرمەزار، شەرمەندە بنووسین یا لە جیاتیی بیسەر ، شنەوەندە بەکار بهێنین .

## وشەی گوایە !! واتە (شاکم)

زۆرتری نزیک بە گشتی نووسەر، وەرگێڕ، وێژەر، خوێنەر، توێژەر، دەمڕاستەکانی بەرنامە تێلێویزیۆنیەکان و نووسراوەکانی چاپەمەنی و پەرتووکەکان، وشەی گوایە بەکار ئەهێنن و زۆر بەدەگمەن و بەرێکەوت وشەی شاکم بە کار ئەهێنن و هەندێکیان نازانن کە وشەی شاکم لە زمانی کوردیدا هەیە و (گوایە) لە وشەی فارسیی (گویا)وە وەرگیراوە و هێنراوەتە ناو زمانی کوردی. لەراستیدا بۆ زۆرتری کەسان وا هەست ئەکرێت کە بێجگە لە گوایە، وشەیێکی تر نیە و وشەی شاکم لەبیر براوەتەوە و وەک زۆر وشە و ئایدیۆم و چاوگی تری زمان و رێزمانی کوردی، ئاخنراوەتە کونی قوژبنی لەبیربرانەوە و فەرامۆشی. هەر بۆیە وشەی گوفتوگۆ کە فارسی یە، لە جیاتیی وت و وێژ بەکار ئەهێنرێت و لە کوردیی باکووریشدا چاوگی (ئاخافتن)مان هەیە بەڵام هەتا گوفتوگۆ وێستابێ، بەدەگمەن ئاخاڤتن بەکار ئەهێنرێت و تەنانەت بەکەمی لە وشەی (وتووێژ) کەڵک وەر ئەگیرێت.دیارە بەکاربرانی گوفتوگۆ لە هۆنراوەدا لە بەر کێشی هۆنراوە و بڕگەکان، قەید ناکات، وەک ئەم هونراوەی مامۆستا هەژار:

گوفتی من گەوهەرە بۆت هەڵڕێژم / تاقە دوو رێت لە بەرە پێت بێژم

یان، وشەی ئاسایش بە کار ئەهێنرێت کە ئەویش وشەیێکی فارسی یە و لە باری ڕێزمانەوە پێی ئەڵێن اسم‌المصدر واتە ناوی چاوگ و لە ئینگلیسیدا security و لە زمانی عەرەبیدا امن(ئەمن) و ئەمنیە بەکار ئەهێنرێت و کوردەکانیش ئەبێ وشەیێکی بۆ بدۆزنەوە یان بۆی داتاشن.

شایانی سەرنجە کە لە زمانی ئینگلیسیدا وشەی security هەیە و لە فەڕانسەییدا ئەڵێن سێکرێتێر، بەڵام بەداخەوە کوردەکانی عێراق بەپێی ئەوەی کە لە زمانی عەرەبیەوە ئەوترێت، ئەڵێن سکرتێر و ئەمەیش زۆر هەڵەیە.

هەڵسەنگاندنی دروست و هەڵەی ئەم وشەیە:

| دروست – بە پیتگەلی عەرەبی و لاتین | هەڵە – بە پیتگەلی عەرەبی و لاتین |
|---|---|
| سێکرێتێر sêkrêtêr | سکرتێر sikirtêr |

لە بەر ئەوە کە سێکرێتێر کەسێکی رازدار و قسە قووتدەر و بڕواپێکراو بووە، بۆیە ئەم ناوەیان لێ ناوە چونکە secret لە زمانی ئینگلیسیدا (سیکریت) واتە راز و فەڕانسەیی یەکان ئەڵێن سێکرێتێغ(سێکرێتێر) واتە کەسێ کە راز و رەمز نادرکێنێت . ئەوکەسانە کە کاروباری نووسینگە و تایپ و بەرنامەکانی بەڕێوەبەری گشتی و کاربەدەستە پایەبەرزەکان بە رێوە ئەبەن، پێیان ئەوترێت سێکرێتێر. لە رێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکاندا، بە سەرۆکی گشتی یان بە یە بەڕێوەبەری گشتی ئەڵێن سێکرێتێری گشتی و لە ئینگلیسیدا پێی ئەڵێن secretary General. عەرەبەکان ئەڵێن سکرترالعام و بە فارسی پێی ئەوترێت دبیرکل کە لە دوو وشەی عەرەبی پێک هاتووە.

## نووسین و وەرگێڕان لە زمانی کوردیدا و نموونەی شوێنەواری کارتێکران بە هۆی فەرهەنگی زمانی عەرەبییەوە لە کوردستانی باشووریدا

لە بەشەکانی پێشوودا بەکورتی باسی ئەوەمان کرد کە زۆر کەس فەرهەنگی زمانی کوردی بە پێی فەرهەنگ و ڕێزمانی عەرەبی و هەندێ زمانی‌تر ئەنووسن و وەریان ئەگێڕنەوە و ئەم کارە زەبرێکی کاولکەرانە و تێکدەرانەی لە زمان و فەرهەنگی کوردی داوە و بە چەشنێک پەرەی سەندووە کە قەرەبووکرانەوەی زۆر سەخت و پڕ لە کەندوکۆسپ و تەگەرە و لەمپەرە. با نموونەی ئاسایی و ساکاری ئەو هەڵە و کارتێکرانە بهێنینەوە:

لە شەوی ٢٩/٣/ لە سەر ٣٠/٣/٢٠٠٩ دا، تێلێویزیۆنی کوردسات لە بەشی هەواڵەکاندا ئەم ڕستەی خوێندەوە:

ئەمڕۆ بەڕێز عومەر فەتتاح پێشوازیی کرد لە وەفدی مافەکانی مرۆڤ لە سلێمانی.

لێرەدا چەند ڕەخنە لە باری ڕستەسازی و جێگەی هەرکام لە وشەکانەوە ئەخەینە بەر تاو توێ و شی‌کردنەوە:

بە هۆی ئەوەوە کە لە زمانی عەرەبیدا، ئاوەڵکاری جێگە (قیدمکان) لە زۆربەی ڕستەکاندا ئەخرێتە دوای هەموو وشە و بڕگە و بەشەکان و ئەبێتە گاوانی، کوردەکانی باشووری کوردستانیش هەر بەم پێی فەرهەنگی زمانی عەرەبی، ڕستەکان ئەنووسن و وەریانئەگێڕنەوە و ئەیانخوێننەوە. لە ڕستەی ناوبراودا کە لە

تیلیویزیۆنی کوردساتەوە بڵاوکرایەوە، ئەتوانین بەم چەشنە وشە و بڕگە و ئاوەڵکاری جێگە بگۆڕین و بنووسین و ئاوا وێژەیی و دروستە:

ئەمڕو بەڕێز عومەر فەتتاح لە شاری سلێمانی پێشوازیی لە وەفدی مافەکانی مرۆڤ کرد.

دیارە مەبەست لە وەفد، کۆڕی نوێنەرایەتی یە. لێرەدا پێویستە ئاوەڵکاری جێگە (سلێمانی) بخرێتە پێشەوە و نوسین و خوێندنەوەی ئەم ئاوەڵکارە لە دوای گشتی وشە و بڕگەکان و لە دوایین بەشی رستەکەدا، بۆ زمانی کوردی هەڵەیە چونکە رێزمانی کوردی لەگەڵ رێزمانی عەرەبی و ئینگلیسی و زۆر زمانی تردا جیاوازیی هەیە. لە زمانی ئینگلیسیدا هەر وەک عەرەبی، زۆرجار ئاوەڵکاری جێگا ئەخرێتە دوای هەمووی رستەکە، یان بەر لە ئاوەڵکاری کات ئەنووسرێت. لە زمانی کوردیدا، ئەگەر کار و کردەوە چ دارێژراو بێت، چ لێکدراو، چ ئاسایی و ساکار، سەرەتا بەرکار ئەنووسرێت، ئەمجار کار و کردەوە ئەنووسرێت.لە رستەکەی کوردساتدا، پێشوازیی کرد لە وەفدی مافەکانی مرۆڤ، هەڵەیە و ئەبێ بنووسرێت و بوترێت: پێشوازیی لە وەفدی مافەکانی مرۆڤ کرد. ئەگەر کار و کردەوە لە پێش بەرکار (وەفدی مافەکانی مرۆڤ)دا بنووسرێت، هەڵەیە وشێوەی فەرهەنگی عەرەبیی هەیە. لە رستەی یەکەمدا کە هەڵەیە، گوێگر و بیسەر وا تێ ئەگات کە وەفدی مافەکانی مرۆڤ لە شاری سلێمانی یە، بۆیە سلێمانی خراوەتە دوایین جێگە و جەخت و تأکید کراوەتە سەر جێگەی وەفدەکە. بەڵام لە رستەی دووەمدا کە دروستە، گوێگر و بیسەر تێ ئەگات کە شاری سلێمانی جێگەی پێشوازی بووە،

نەک شوێن و جێگەی جێگیربوون و نیشتەجێ بوونی وەفد و کۆڕی نوێنەرایەتی.

لە رستەی یەکەمدا، گرنگایەتیی شاری سلێمانی، لە بەر ئەوەیە کە جێگاو شوێنی وەفدی مافەکانی مرۆڤ بووەوە، بەڵام لە رستەی دووەمدا کە دروستە، شاری سلێمانی لە بەر ئەوە گرنگە کە جێگا وشوێنی پێشوازی بووە. با سەرنجێکی تر بدەینە رستەکان:

١- ئەمرۆ بەڕێز عومەر فەتتاح پێشوازیی کرد لە وەفدی مافەکانی مرۆڤ لە سلێمانی.(هەڵە)

٢- ئەمرو بەڕێز عومەر فەتاح لە شاری سلێمانی پێشوازیی لە وەفدی مافەکانی مرۆڤ کرد.(دروست)

ئەگەر کار و کردەوە لە چەشنی داڕێژراو یان لێکدراو بێت، ئەبێ بەرکار لە نێوان دوو بەشی کارەکەدا بنووسرێت واتە لە نێوان (پێشوازی) و (کرد) دا بنووسرێت.

هەر تێلێویزیۆنی ناوبراو لە رێکەوتی شەوی ٢/٤ لە سەر ٣/٤/٢٠٠٩ دا لە بەشی هەواڵەکاندا رایگەیاند:

ئەمرۆ بەڕێز عومەر فەتتاح پێشوازیی کرد لە کۆمەڵێک خەڵکی سەیدسادق.

ئەڵبەتە رەنگە وشەیێکی رستەکەم لە بیر نەمابێت، بەڵام رستەکە بەو شێوەیە داڕێژرابوو.

ئەمەیش دروستی ئەو رستەیە:

ئەمرۆ بەڕێز عومەر فەتاح پێشوازیی لە کۆمەڵێک خەڵکی سەید سادق کرد.

هەروا کە لە پێشەوە وتمان، ئەبێ لە کار و کردەوەی دارژاودا، بەرکار (کۆمەڵێک خەڵکی سەیدسادق) بخرێتە نێوان دوو بەشی کارەکە واتە لە نێوان (پێشوازی) و (کرد). دیارە پیتی (ی) کە بە پێشوازییەوە لکاوە، راناوی لکاوی سێەم کەسی تاقی بزرە. کە واتە، ئەبێ (کرد) واتە بەشی دووەمی کارەکە، بخرێتە دوای گشت وشەو بەشەکانی رستەکەوە.

هەر لە شوەی رێکەوتی ٢/٤/٢٠٠٩ دا، تێلێویزیۆنی کوردسات لە سەرەتای هەواڵەکاندا بڵاوی کردەوە و وتی:

سەرۆک مام جەلال لە قەڵاچوالان بەشداریی کۆبوونەوەیێکی کرد لەگەڵ کۆمەڵێک لە فەرماندەیی هێزی پێشمەرگە.

سەرەڕای ئەوە کە رستەی ناوبراو هەڵەی تریشی تێدایە، ئەتوانیین بەم چەشنە بینوسین:

کۆبوونەوییێک لە قەڵاچوالان بە سەرۆکایەتیی سەرۆک مام جەلال و بەبەشداریی کۆمەڵێک فەرماندەری هێزی پێشمەرگە پێک هات. لێرەیشدا کاری تێ پەڕی نادیار (پێک هات) خراوەتە دوای هەمووی وشەکان. دیارە رستەکە بەرکاری راستەوخۆی تێدا نیە. بێ گومان، سەرۆکی رێکخراو و حیزبێک، وەک ئەندامان و لێپرسراوانی پلەی خوارەوە و ژێر فرمان، بەشداری ناکات و بانگێشتن نەکراوە، بەڵکوو سەرۆکایەتی ئەکات و بە پێی فرمانی ئەو، ئەوانی تر کە لە پلەی خوارەوەتردان لە کۆبوونەوەکەدا بەشداری ئەکەن. دیارە یەکێ لە هەڵەکان، لەبەر چاو نەگیرانی Syntax (نحو) واتە دارشتن و لێکدان و رێککاریی رستەکانە.

دیاره ئەتوانین جێگەی پێک هاتنی کۆبوونەوەکە، واتە قەڵاچوالان بخەینە دوای سەرۆک و فەرماندەرەکان، بەڵام لە بەر ئەوە کە کۆنفرانسەکە لە شوێنێکی کوردستان لە لەیەن سەرۆکی کۆماری عێراقەوە پێک هاتووە و جێگەی بارەگای سەرۆک بووە، باشترە لە دوای وشەی کۆبوونەوە و لە پێش وشەکانی تردا بنووسرێت چونکە ئەو جێگەیە گرنگایەتیی زۆری هەیە و وەک ناوەندی فەرماندەریی سەرۆکی رێکخراوەکە ناسراوە. شایانی سەرنجە کە لە کورستانی باشووری و لە زۆرترین جارەکان و بە تایەبەت لە کوردستانی ئێراندا، لە جیاتیی وشەی فەرماندەر، وشەی فەرماندە ئەنووسن. دیارە فەرماندە فارسی یە و قرتاو (مرخم)ی (فرماندهنده)یە ونیشانەی بکەر (ندە) لابراوە و کوردی یەکەی ئەبێتە فەرماندەر کە ئەمەیش ئاوەڵناوی بکەری لێکدراوی قرتاوە و لە بنەڕەت و سەرەتادا (فەرماندەرەر) بووە و (ەر) کە نیشانەی بکەرە و بەرانبەری (ندە)ی فارسی یە، لابراوە و بووەتە فەرماندەر. کەواتە، فەرماندە فارسی یە و فەرماندەر کوردی یە. ئەتوانین بڵێین (فەماندەرەر) ئاوەڵناوی بکەری لێکدراوی نەقرتاوی ئاسایی و ساکارە. نموونەی هەڵەگەلی رێزمانی و وەرگێڕان ئەخەینە بەر باس و لێکۆڵینەوە و رخنە و تاوتوێ و بە پیتگەلی لاتین و عەرەبی لە هێڵکاری و تابلۆی لاپەڕەی دوایی‌دا روون ئەکرێنەوە:

←

| ئاوەڵناوی بکەری لێکدراوی قرتاو بەپیتگەلی عەرەبی و لاتین | | ئاوەڵناوی بکەری لێکدراوی نە قرتاوی ئاسایی، بەپیتگەلی عەرەبی و لاتین | |
|---|---|---|---|
| فەرماندەر | Fermander | فەرماندەرەر | Fermanderer |
| یارمەتی دەر | Yarmetîder | یارمەتی دەرەر | Yarmetîderer |
| پەرەپێدەر | Perepêder | پەرەپێدەرەر | Perepêderer |
| جەرگ سووتێن | Cergsûtên | جەرگ سووتێنەر | Cergsûtêner |
| خەم ڕەوێن | Xemrrewên | خەم ڕەوێنەر | Xemrrewêner |
| دەرزی وەشێن | Derzîweşên | دەرزی وەشێنەر | Derzîweşêner |
| چڵکاو چەڵەپێن | Çillkawçellepên | چڵکاو و چەڵەپێنەر | Çillkawçellepêner |
| دوژمن بەزێن | Dujminbezên | دوژمن بەزێنەر | Dujminbezêner |
| سەماکەر | Semaker | سەماکەرەر | Semakerer |
| هەواڵ نێر | Hewallnêr | هەواڵ نێرەر | Hewallnêrer |
| گۆرانی بێژ | Goranîbêj | گۆرانی بێژەر | Goranîbêjer |

**شەوی ٢٧ لە سەر ٢٨/٤/٢٠٠٩ تیلیڤیزیۆنی کوردسات لە سەرەتای هەواڵەکاندا لە سەر تەختایی (شاشە)ی تیلیڤیزیۆندا بە پیتگەلی لاتین نووسیبووی:**

Peywendî Nîştîmanî

**کە ئەبووایێ بینوسیایێ**

Peywendiy Nîştimanî

**هەر لە ڕێکەوتی ناوبراودا تیلیڤیزیۆنی ناوبراو نووسیبووی:**

Rêzlênanî kesayetyek

**کە ئەبووایێ بینووسیایێ:**

Rêznan le kesayetyek

**لە نووسراوەکەی کوردساتدا، کەسایەتی بکەرە و واتای ئەوە ئەدات کە کەسایەتی ڕێزی لە کەسێک یان لە کەسانێک نابێت. بەڵام لە نووسراوەکەی دووەمدا کە دروستە، کەسایەتی بەرکارە و واتای ئەوە ئەدات کە کەسێک یان کەسانێک ڕێزیان لە کەسایەتی‌یێک ناوە.**

**شەوی ٢٩/٤/٢٠٠٩ لە سەر ٣٠/٤/٢٠٠٩ کوردسات لە هەواڵەکانی خۆیدا نووسیبووی:**

←

یەکێ لەو دەرمانانەی زۆر بەکار ئەبرێ لە لایەن هاوولاتیانەوە لە کەرکووک.

ئەبووایێ بینوسیایێ:

یەکێ لەو دەرمانانەی کە لە کەرکووک لە لایەن هاوولاتیانەوە زۆر بەکار ئەهێنرێت.

شەوی ۲۲ لە سەر ۲۳/۵/۲۰۰۹، تیلیۆیزیۆنی کوردستان تی.ڤی. لە بەرنامەی وێنەهەواڵدا بە پیتگەلی لاتین لە سەر تەختایی شووشەی تێلێویزیۆندا نووسیبووی:

ئوسترالیا: نزیکەی ۶۰۰۰ کەس ماڵی خۆیان جێ هێشت بە هۆی مەترسی لافاو.

کە ئەبووایێ بینووسایێ:

ئوسترالیا: نزیکەی ۶۰۰۰کەس بە هۆی مەترسیی لافاوەوە ماڵی خۆیان بەجێ هێشت.

یان:

بەهۆی مەترسیی لافاوەوە، نزیکەی ۶۰۰۰ کەس ماڵی خۆیان بەجێ هێشت.

شەوی ۱۰ لە سەر ۱۱/۶/۲۰۰۹ تیلیۆیزیۆنی کوردسات لە بەشی هەواڵەکانی خۆیدا لە بارەی کەرکووکەوە، کاتێ کە رزگار عەلی قسەی ئەکرد، بە پیتی لاتین نووسیبووی :

Lêdwan

کە ئەبێ ئاوا راست بکرێتەوە:

Lêdiwan

شەوی ۲۲ لە سەر ۲۳/۶/۲۰۰۹ هەر تیلیۆیزیۆنی کوردسات لە بەرنامەی هەواڵەکاندا لە سەر تەختاییی شووشە نووسیبووی:

Dîdarî serok Talebni û eşîretî zengene.

کە ئەبێ ئاوا راست بکرێتەوە:

Didarî serok Tallebni w eşîretî zengene.

شەوی ۲ لە سەر ۳/۸/۲۰۰۹دا تێلێویزیۆنی کوردسات لە بەشی هەواڵەکاندا رایگەیاند:

پاشماوەکەی لە لاپەڕەی دواییدایە ←

« دوای دەزگیرکردنی سێ ئەمەریکی لە لایەن هێزەکانی کۆماری ئیسلامیی ئێرانەوە، حوکومەتی هەرێمی کوردستان بەیانیەیێکی بڵاوکردەوە».

لێرەدا ئەبێ لە جیاتیی چاوگی (دەزگیرکردن)، ناوی بەرکاری نادیار واتە (اسم مفعول مجهول) کە ئەبێتە (دەزگیرکران) بەکار بهێنرێت چونکە دەزگیرکراوەکان بەرکارن و ئەبێ ئا بەم پێیە رستەکە بنووسرێت:

«دوای دەزگیرکرانی سێ ئەمریکایی لە لایەن ....».

شەوی ٩ لەسەر ١٠/٨/٢٠٠٩دا تێلێویزیۆنی کوردسات لە بەشی هەواڵەکاندا لە بارەی ئاوارەکانی نیشتەجێی کەرکووکەوە رایگەیاند:

قەرەبووکردنەوەی ئاوارەکانی نیشتەجێی کەرکووک.

کە ئەبوایێ ئاوا رایگەیاندایێ:

قەرەبووکردنەوەی زیانەکانی ئاوارەکانی نیشتەجێی کەرکووک.

دیارە هەروا کە لە بەشەکانی پێشوودا باسمان کردوە، زیانەکان قەرەبوو ئەکرێنەوە نەک مرۆڤەکان.

شەوی ١١ لە سەر ١٢/٨/٢٠٠٩دا تێلێویزیۆنی کوردسات لە بەرنامەی هەواڵەکاندا لە زمانی وەزیری دەرەوەی تورکیەوە رایگەیاند:

تورکیا دەیەوێت ئەمنیەت و ئاسایش پێک بێنێت لەگەڵ ئەو وڵاتانەدا کە ئەکەونە سەر رووباری فورات.

دروستی وەرگێڕاوی ئەو رستەیە، لەم پێیەیە:

تورکیا دەیەوێت لەگەڵ ئەو وڵاتانەدا کە لە سەر رووباری فوراتدا هەڵکەوتوون، ئەمنیەت و ئاسایش پێک بێنێت.

دیارە ئەبێ وشەی (وڵاتەکان) بخرێتە پێشەوە چونکە لە رستەکاندا گرنگ ترەو ئەمنیەت لەگەڵ ئەوەدا دێت و وەرگێڕاوەکەی کوردسات بە پێی سینتاکس (نَحو)ی عەرەبیە.

شەوی ١/١/لە سەر ٢/١/٢٠١٠ تێلێویزیۆنی کوردستان تی.ڤی لە کۆتاییی

بەرنامەی فیلمێکی وەک خۆیدا لە بارەی پڵنگێکی سایبێریاوە لە سەر تەختاییی

**شووشەی تیلیویزیۆندا بە پیتگەلی لاتین نووسیبوویی :**

Pilingî saybîrî fêlbaz

**ئەم رستە و وەرگێڕانە هەڵەیە ، لەبەر ئەوە کە لە کوردیدا واتای ئەمە ئەدات کە سایبیریا فێڵەباز بێت . سایبیریای فێڵەباز واتای خوی بەخۆیەوەیە .**

**راست و دروستی ئەو رستەیە ئەبێ ئا بەم پێیە بێت :**

Pillingî fêllebazî saybêrî

**چونکە لە رستەکەی کوردستان تی.ڤیدا ئاوەڵناوی فێڵباز ئەگەڕێتەوە بۆ سایبیریا بەڵام لە رستەی دووەمدا کە دروستە ، ئاوەڵناوی فێڵەباز ئەگەڕێتەوە بۆ پڵنگ ، چونکە پڵنگ فێڵەبازە نەک سایبیریا . بێجگە لەمانە ، گیان لەبەرەکەیش بەور (بەبر) بوو نەک پڵنگ. لە بەشی سەرەتادا کورتە باسێکمان لێ کردووە .**

## وشەی نیشتمان

ئەگەر بینەر و گوێگرەکانی بەرنامەتیلیویزیۆنیەکانی کوردسات و هەندێ بەرنامەی کوردییتر بە جوانی سەرنج بدەنە بەشی هەواڵەکان، زۆرجار بۆیان دەرئەکەوێت و هەست ئەکەن کە هەندێ کەس لە خوێنەر و وێژەرەکان لە جیاتیی وشەی نیشتمان ئەڵێن (نیشتیمان)، واتە پیتی (ی) ئەخەنە نێوان (ت) و (م) و ئەگەر بە پیتگەلی لاتین بینووسین ئەبێ ئاوا بنووسرێت: Nîştîman واتە پیتی î لە نێوان t و m دا زیادی یە و لە جیاتیی کورتە بزوێنی i ئەیلێن. ئەمەیش یەکێکی ـ تر لە نیشانە و بەڵگەکانی نەبوونی هەستی لێپرسراوەتی و بەرپرسایەتیی ئەو چەشنە کەسانەیە و لەوانەیە کە لە داهاتوودا لە نووسینیشدا ئەم پیتە زیادی‌یە بگونجێنن و وەک زۆروشەو چاوگ و ئایدیۆمی‌تر، گۆڕانی بەسەردا بهێنن ولەبریی کورتەبزوێن و بزرۆکە، بیکەن بە î ، مەگەر لە داهاتوودا دەست لەم هەڵە هەڵگرن و هەستی پێبکەن.

نموونەی ئەم هەڵە گەورە و زەقە:

شەوی ۱۱/۵/۲۰۰۹ لە سەر ۱۲/۵/۲۰۰۹ تیلیویزیۆنی نەورۆز چەند خولەک لەپێش بەرنامەی پۆلیس و کۆمەڵ (Polîs û komell) دا بۆ ماوەییێکی زۆر کە دیمەنی کوردستانی پیشان ئەدا، لە سەر تەختاییی شووشەدا بە پیتگەلی لاتین نووسیبووی:

Nêştîman

کە ئەمەیش زۆر جێگەی رەخنەیە و ئەبووایێ بینووسیایێ:

←

Nîştiman

له جیاتیی نیشتمان، نووسیبووی نێشتیمان.

جا بڕوانن که چەندە تووشی هەڵە بووون، هەروەها له جیاتیی پیتی î له دوای N، پیتی (ê)ی نووسیبوو، واته له جیاتیی Nîştiman ، نووسیبووی Nêştîman. لەیەک وشەدا دوو پیت به هەڵه نووسرابوو.

له ڕێکەوتەکانی ۱۲ و۱۳/۸/۲۰۰۹دا کوردستان تی.ڤی له بەرنامەی خۆیدا لەبارەی لاوانەوە که وتوویژی تێلێویزیۆنیی نێوان هەولێر و سلێمانی بڵاو ئەکرایەوە، له سەر تەختاییی شووشەی تێلێویزیۆندا به پیتگەلی عەرەبی نووسیبووی:

لاوان لەبەردەم ئەرکه نیشتیمانیەکاندا

که پیتی (ی)ی به زیادی له نێوان دو پیتی (ت) و (م)دا نووسیبوو، بۆیه لەوانەیه له داهاتوودا ئەم پیته به زۆرەملی به سەر (نیشتمان)دا بسەپێنرێت و ئەمەیش چاککاری:

لاوان لەبەردەم ئەرکه نیشتمانیەکاندا.

هەروەها به پیتگەلی لاتینیش بەهەڵه نووسیبووی:

Lawan leberdem erkenîştîmanyekanda.

واته له جیاتیی کورته بزوێن(i)، پیتی (î) نووسرابوو، بۆ ئەوە دەنگی (نیشتیمان) بدات، ئەمەیش چاککاری:

Lawan leberdem erke nîştimanîyekanda

تەنانەت پیتی (î) که له پێش پیتی (y)ەوە پێویست بوو، نەنووسرابوو، که له سەرەوە چاکمان کردووە.

ئیستا زۆر وشەی هەڵەی تریش لە بەرنامە تیلیڤیزیۆنە کوردیەکانەوە ئەبیسین کە ژمارەیان فرەن ونموونەی ئەو هەڵە و نادروستیانە ، وشەگەلی(خواردن و بەتایەبەت)ن.

بۆ وێنە ، فرە کەس ئەڵین خواردنمان نیە ، یا ئەڵێن لە چێشتخانە خواردنی جۆراوجور هەیە .

خواردن چاوگە نەک شتێک کە ببینرێت و دەستی لێ بدرێت و بخورێت . خواردن عونسورِی ماددی نیە . پێویستە لە جیاتیی خواردن بڵێین و بنووسین خواردەمەنی یا لانی کەم بڵێین خۆراک . بو (**خواردن**) وەک ئەوەیە بڵێین (**سارد بوونەوە** )کە چاوگن . بەڵام ساردەمەنی وەک (**خواردەمەنی**) یە و واتایی و مەعنەوی نیە.

هەروەها بە وشەی (**بەتایەبەت**) ئەڵێن بە تایەبەتی .

(بەتایەبەت) وەک وشەگەلی بەرێکەوت ( بە سودفە = تصادفاً ) بە دەگمەن ( ندرتاً ) .

بە ئاستەم ، بە کومەڵ . . . هتد .

من بەتایەبەت ئەم بەرنامەیەم بەدلە . لێرەدا ناتوانین بڵێین بە تایەبەتی .

من بەتایەبەتی دێم بو ماڵی ئیوە . لیرەدا (بەتایەبەتی ) دروستە .

تەنانەت زۆربەی بەرپرسیارە پایە بەرزەکان لە سەر تەختاییی شووشەی تیلیڤیزیۆندا لەجیاتیی (بەتایەبەت ) وشەی ( **بەتایەبەتی** ) بە کار ئەهێنن و بو نموونە ئە لێن :

بینەرە بەرِێزەکان **بەتایەبەتی** کەس و کاری ئەنفال کراوەکان . کە لێرەدا پیتی ( ی ) زیادی یە و ئەبێ بڵێین : بینەرە بەرِێزەکان **بەتایەبەت** کەس وکاری ئەنفال کراوەکان.

# سپاسی فرە بۆ گشت خوێنەران

نویسنده‌ی کتاب استاد بخش مطالعات خاورمیانه و اسلام در دانشگاه تورنتو و از شرق‌شناسان و ایران‌شناسان بنام است که آثار دیگری نیز در زمینه‌ی تاریخ و فرهنگ ایران دارد. وی در این کتاب تاریخ سیاسی و نظامی دوره‌ی صفوی و سیاست داخلی و خارجی صفویان را با توجه به ساختار اجتماعی ـ اقتصادی و حیات فکری و فرهنگی ایران در این روزگار بررسی می‌کند.



ISBN: 978-964-305-127-3

۶۲۰۰ تومان